## ووتەی ژمارە

کاتێك ئـــەم ژمارەیەی ( بەیان ) لە ژێر چاپدا بوو ، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش ، یاسایێکی گرنگی دەرکرد ، بەناوی ( یاسای دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی ) ژمارە ( ٢٩ ) و بەپێی ئەم یاسایە دەزگا کە ئەتوانێ چەندەها رۆژنامەو گوڤار دەربکات‌و چاپخانە دابمەزرێنێ‌و لقی تر بکاتەوە لە سەرانسەری عیراقماندا ، بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی خۆی ، کە بریتین لە بوژاندنەوەی کەلەپوری نەتەوایەتی گەلی کوردمان‌و گەشەپێدان‌و پێشخستنی بزوتنەوە رۆشنبیرییەکەی لە هەموو لایێکەوە .

( بەیان )یش وەکو هەموو بلاوکراوەکانی تری ئـــەم دەزگایە سود لەو هەل‌و توانا فراوانانە وەرئەگرێت کە بەپێی یاسا بۆ دەزگاکە دانراوە‌و دەورێکی کاریگەری ئەبێ لە گۆرینی ( بەیان ) و گەشەپێدانیدا لە روی چۆنی‌و چەندی بابەتەکانی‌و ناوەروکەکـــەیانی‌و چ لەروی دەرهێنـــانی هونەری‌و پێشخستنیەوە .

بێگومان ئەمە لایێکی مەوزوعەکەیە ، چونکە سەرکەوتنی روژنامەیێك یا گوڤارێك ، بەشێوەیەکی سەرەکی بەندە بـــە جۆرو چـــەندیی خوێنەرانی‌و بە بەهێزی وەیاخـــود لاوازی پەیوەندی نێوان بلاوکراوەکەو خوێنەرانیدا .

دیاریشە ئێمە سورین لەسەر ئەوەی پەیوەندی لە نێوان ( بەیان )و خوێنەرانی بەهێزتر بێت لەوەی جاران‌و بەدل بـــە پەرۆشی ئەوەین ، رۆشنبیرو نوسەرو خوێنـــەرانی بەرێز ، بەپێی توانا بەشدارییێکی راستەوخۆ بکەن لـــە دەرهێنانی ( بەیان ) ، لەپێناو خزمەت‌کردنی رۆشنبیری پێشکەوتنخوازی گەلی کوردمان بەتایبەتی‌و هی نیشتمانی عیراقی خۆشەویستمان بەگشتی .

## لەم ژمارەیەدا




**ناونیشان :**
دار الثقافة والنشر الكردية
ساحة الخلاني - بغداد
تەلیفۆن :
٦٨٣١١ ـ ٦٨٣١٢ ـ ٦٨٣١٣

نرخی ٥٠ فلسە



# بەیان

گـــۆڤـارێکی رۆشنبیری گشتییە
دەزگای رۆشـــنبیری و بـلاوکـردنـەوەی کـــوردی
مـانـگی جـارێ بـلاوی ئـەکـاتـەوە



د. منيف رەزاز

یەکەم قۆنـاغی سوشیالیزم ، بەتایـبەتی ئەگەر بەگوڕ بـەرەو پەرە پێـدان ڕۆیـی لەسەر حیسـابی جێبەجێ کردنی بەپەلـەی داواکاری‌یەکانی میللەت ، ناچار هەندێ دڵەڕەقی‌و توندو تیژی تیا ئەبێ ، تەنانەت بەرامبەر هێزە کارکەرەکانیشەوە ، بۆیەکا ئەگەر هاتو ئەم هێـزانە باوەڕیـان بە خۆبەخـت کردن نـەبێ‌و لە پێداویستەکانی قۆناغەکە نەگەن‌و بەشداری نەکەن لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی قۆناغەکە ، ئەوە سەرەنجامی قۆناغەکە لەناوچـوونە وەیاخود ئەبێ بـە سیستەمێکی پۆلیسی‌و دڕندە کـە کەرامەتی ئەم هێـزانە تیا ئەبێتە قۆچی قوربانی .

بۆیـە وتـراوە ( سۆشـیالیزم نی‌یـە بـەبێ سۆشیالیستەکان ) ، چونکە سوشیالیزم تەنها کۆمەڵە یاساو ڕێبازێك نی‌یەو بەس ، بەڵکو لە پلەی یەکەمدا بیروباوەڕو توانا ، کە ئەبێ خۆی لەو هێزە کارکەرانەدا بنوێنێ کـە خـاوەنی بـەرژەوەندە بنچیـنەکەن لـەم ڕژێمانەدا .

ئەم هێزانە ئەبێ بەر لە هەموو شتێك لەهەست کردن بـە چەوساندنەوەو ژێردەسـتی ڕزگار بێـت‌و هەست بکا کە چۆن لەم کۆمەڵەدا مافی هەیە ئەوهاش ئـەرکی لەسەرەو ، هـەر لە بەرژەوەنـدی خۆشیەتی ئەرکـەکانی بـەجێ بهێنێـت بەقـەدەر ئـەوەی لـە بەرژەوەندیەتی مافـەکانی بەدەست بهێنێـت ، هەروا پێویـستە بەسەربەسـتی‌و هەسـت کـردنیش بـە لێپرسینەوەو ئەرکەکانی بەجێ بهێنێ‌و مافەکانیش لـە چنگی خۆیابێت .

بۆ ئەوەی هێـزە کارکەرەکان بتـوانن بەتەواوی ئەرکەکانی خۆیان بەجێ بهێنن پێویستە لەگەڵ کارکردن‌و جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیاندا بە پوختی ڕێگای خـۆ فێرکـردن‌و تاقی‌کردنـەوەو مەشقیشیان لەبەردەمـدا بکرێتەوە .

قۆناغی یەکەم لەدامەزراندنی
سۆشیالیزم
د. مونیف رەزاز

# ڕۆشـــنبیری کوردی لـە چوارچێوەی ڕۆشــنـبـیری یەکێتی نیشتمانیدا چـــی دەگـەیەنێ؟ ،

ئەحمەد بەهزادی [illegible]ی کردوە

**لە چاوپێکەوتنێکی [ بەیان ]دا لەگەڵ چەندکەسێك کە لە مەیدانی ڕۆشنبـیری کوردیدا دەوریـــان هەیە گفتوگۆیەکمان کرد دەربارەی چالاکی ڕۆشنبیری لەپێناوی گەشەکردنی گشتیو گۆڕانی دیموکراتیو سۆشیالیستی لە ولاتدا ، دەربارەی پێکەوە یەکگـرتنو یەکانگیربوونی نێوان ڕۆشنبیری نیشتمانیو ڕۆشنبـیری کوردیدا کە ڕویەکە لـەروەکانی بەرزکردنەوەی بـیری یەکـێتیی نیشتمانیو دوارۆژی ڕۆشنبیری گەلو بناغەی مێژووی ڕۆشنبیریی نیشتمانیمان .**

نەخشـەی گۆڕانی باری ڕۆشنبـیری گەلی عیراق ئیستا بە تاقیکردنەوەیەکی وردو چالاکی شۆڕشگێڕانەدا ئـەڕواتو تێکرا لایــەنەکانی [ رامیاری ، ئابـووری ، ڕۆشنبیری ] لــە قۆناغێکی نـوێدا خۆی ئەبینــێ .. لێرەشدا ســوودیان لە تیشـکی ڕاپۆرتی ســیاسـیی هەشتەمین کۆنگرەی قوتری حـزب وەرگرتووە .. وە دلنیابوون لەسەر ئەم گۆڕانکاریەش بەستراوە بە دەس پێشکەری کردنەوە .. ئەمەش لەسەر گرنگی پاڵپشت کردنی مەبدەئی یەکڕێکخستنو هاوشانی لەجوڵانەوەداو سەرکردایەتیکردنی کاروانی پێشکەوتنی ئەم جموجوڵە ئەبێ ، چونکە هەر یەکە ئەلقەی کارگەرو کارلێکراوەو لە گۆڕانی گشتیدا بەیەکەوە بەستراون .

ئەگەر یەکێتی جووڵانەوەی نیشتمانیو دیموکراتیو سوشیالیستی یەکبن لە وڵاتاو لەیــەك دابڕ نەکرێنو کاری گەشە کردنی ئابووری لە تەواو کردنو داهێنانی هاوبەشـداو لە پەلــەلێکردنی پەروەردەبــوونیا مانای فراوانتـر بەخشێ ، ئـەی یەکێتی لایەنــە جیاکانی ڕۆشنبیری نیشتمانی لە وڵاتەکەماندا چیە ؟ کە ڕاستەو

خۆ پەیوەندیــەکی تونـدی لەگـەڵ عەقـڵی خەڵـكو نەرێتەکەیانەوە هەیە ــ ڕاپۆرتی سیاسی ــ ، وەیاخود ئەوپەیوەندیە دینامیکیە چیە لەنێوان ڕێبازی ڕۆشنبیری نیشتمانیو لایەنە تایبەتیەکانی ڕۆشنبیری میللەتانــەوە هەیە کە لەم وڵاتەدانو شێوەی یەکگرتنیان لەنێو جوغزی جێبەجێ کـردنی خواستو مەبەسـتەکانی شۆڕشدا ئەبێ .

تائێســتا ڕۆشنبـیری بە یەکێــك لە بنـکەکانی دامەزراندنی کۆمــەڵ ئەزانرێ ، ئـەو میللەتانەی لــە زەمینەیەکی دیاریکراودا ڕۆڵەکانیان لەگەڵ یەکدا خاوەنی پەیوەندییەکی مێژووین بێگومان پەیوەندی ڕۆشنبیری هاوبەشیش لەناویانا زیاتر پێکەوەیان ئەبەستێ .. بەم شێوە گشتیـیە **مامۆستا (ئیسماعیل رەسول)** لەگـەڵ هەموو لایەنەکانی ڕۆشنبیری نیشتمانیو کوردیدا بــە شێوەیەکی تایبەتی ــ مەعامەلە ــ ئەکاتو ئەڵێ :

ئەم ڕۆشنبیرییە لە تاقیکردنەوەو زانینی ئـەو میللەتەوە بەتەنیا پەیدا نابێ ، چونکە بوونو بەناوهاتنو گەشەکردنی لەوەوە دێت کە ڕۆشنبیریو شارستانێتی پێشکەوتووی وڵاتــەکانی دراوسێشیان ئەوانــەی کە لەگەڵیدا لەیەك وڵاتدا ئەژین کاری تێئەکا .

بێگومان ڕۆشنبیری هەرە پێشکەوتو کار ئەکاتە سەر ئەو ڕۆشنبیرییەی کە تازە لە گەشەکردندا ئەبێت لەبارەی نــاوەڕۆكو ڕێبازی بیری فەلســـەفییەوە .. میللەتی کورد کە لەم ناوچەیەدا ژیاوە ڕۆشنبیرییەکەی هەر لە کۆنەوە بە شـەپۆلی شارستانێتیی ئەو میللەتانەی کە هەزاران ســاڵ لەگەڵیا ژیاون گەشاوەتەوەو کاری تێ کردووەو بەشێوەیەکی تایبەتی پەیــوەندی مێژوویی‌و

ئاینی‌ی نێوان هەردوو میللەتی کوردو عەرەب لەعێراقداو ژیانی هاوبەشیان لەیەك وڵاتداو پەیوەندی هاوبەشیان لەگۆڕەپانی تێکۆشانی هاوبەشی‌دا دژی هەموو جۆرە هێزێکی زۆردار .

ئەم هەموو هۆیانە بنەڕەتێکی پتەوی بۆ ڕۆشنبیری نیشتمانی هاوبەشی پێك‌هێنا ، ئەمەش ساڵ لەدوای ساڵ گەورە بووەو زیاتر گەشەی کردووە . بەتایبەتی ئاینی ئیسلام بەردەبازێك بو شارستانێتی عەرب‌و ئیسلامی بە هەموو لایەنەکانیەوە گەیاندە نەتەوەی کوردی دواکەوتو .. وا چەند سەد ساڵە زمانی عەرەبی‌و (فقه)و (شەریعەتی) ئیسلام کەرەسەی خوێندنی سەرەکی‌یە ئەمەش لە هەموو مەلبەندی فێرکردن‌و ئاینی شارو دێ‌یەکانی کوردی‌دایەو [illegible]رچاوەی رۆشنبیری‌و زانیاریە .. هەروەها زانا کو[illegible]کانیش وەك [ابن خلکان‌و ابن مستوفی] چەرخی رەوەرەوەی پێشکەوتن‌و پەخش کردنی ئەم ڕۆشنبیری‌یەیان وەپێش خست .

## – با رۆشنبیری‌مان چەکی دەستی جەماوەر بێ –

بەڵام لەم کاتە مێژووییە هاوچەرخەدا ئەو پێشکەوتنە گەورانەی کە لەم چەند ساڵانەی دواییدا ڕوویداو ئاگاداری‌و زانیاری نیشتمانی‌و سیاسی [ هاوشان‌و لەگەلا ] بوو ئەمەش پاش تێکۆشانی میللی دژی ئیستیعمارو کۆنەپەرستان‌و دژی هەموو دواکەوتنێك‌و یەکێتی هەموو میللەتان لە شۆڕش‌و ( انتفاضەکانیدا ) بوو کە کۆلەکەی هەموو بەکرێ گرتن‌و (دیکتاتۆریەتێك)ی لە وڵاتەکەماندا روخاند . ئەمەش لەگەڵ تەوژمی بیری جیهانی لەسەر رۆشنبیری‌مان بە شێوەیەکی گشتی ، ئەمانە هەموو زەمینەیەکی بەپیت‌و بەرەکەتیان بۆ پەروەردەکردن‌و گەشە کردنی ڕۆشنبیری نیشتمانی هاوبەش پێك‌هێنا .

شۆرشی ١٧–٣٠ی تەمموزی نەتەوایەتی‌و پێشکەوتنخواز ئاسۆیەکی‌فراوانی لەبەردەم پەروەردە بوون‌و گەشە پێدانی ڕۆشنبیریی نیشتمانی بە جۆری گەلی عێراقمان بە هەموو نەتەوەکانیەوە ئاواڵە کرد . رۆشنبیری‌یەك کە پاڵ بەبیری شۆرشگێڕێتی سوشیالیستەوە بنێت‌و ببێتە چەکی دەستی کۆمەڵ .. تا پارێزگاری شۆڕشی پێ بکاو بەرەو پێشتری ببات‌و بەشداری ئەو گۆڕانانە بکات کە بەرەو سۆشیالیستی ئەڕوات . ئەمەش لەپێناوی دروست کردنی کۆمەڵێکی تازەدا کە هەموو بە خۆشی‌و کامەرانی لە هەمووبارێکەوە تێیدا بژین .

ناوەڕۆکی رۆشنبیری ئیستاو هەموو لایەنە

# مامۆستا ئیسماعیل رەسوڵ :

# با رۆشنبیریمان چەکی دەستی جەماوەر بێ

سەرەکی‌یەکانی ئەبێ شۆڕشگێرانەو سوشیالیستی بێ‌و لەپێناوی روخاندنی بیری کۆنەپەرستانەو بورژوازیەتدا بێ‌و تا هەموو تەوژم‌و کارکردنەسەر دام‌ودەزگا ڕۆشنبیری‌یەکان‌و کۆمەڵیش بەشێوەیەکی گشتی لەناو ببات .

لەگەڵ ئەمەشدا شۆرش (خاسیەتی) رۆشنبیری میللەتی کوردمان‌و کەمایەتیەکانی‌تری ·لەیاد نەکردوە ، دانی بەمافی ڕۆشنبیری‌یانا ناو چەند دامەزراوێکی ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی بۆیان داناو رۆژنامەو چاپەمەنی‌و بلاوکراوەشیان هەیە ، هەروەها ڕێگای بۆ خۆش‌کردن تاکو گەشە بە رۆشنبیری‌و زمانی نەتەوایەتی خۆیان بدەن‌و ئەدەب‌و هونەرەکەشیان (بە هەموو بەشەکانیەوە) پێش بخەن .. گومانی تیا نیە کە میللەتی کوردمان ئیستا لەسایەی ئۆتۆنۆمی‌دا ئەحەسێتەوە ، رۆشنبیری گەلێك لەناویا گەشە ئەکات ، ئەمەش بەشێکە لە ڕۆشنبیری‌ی نیشتمانی ، بێ‌گومان لەلایەن شۆڕشەوە یارمەتی‌و پاڵپشتی ئەکرێ .

## * رۆشنبیری کوردی ... دەنگ‌و گۆڕان ..

کاك **عەبدولوەهاب تاڵەبانی** هەموو لایەنە نیشتمانیەکانی رۆشنبیری کوردیمان بۆ دەرئەخات کە لە جولانەوەی دەربڕیندایەو لە ناخۆشی‌و ئاوات‌و ئامانجی ملیۆنەها کەس دەرئەبڕێ کە خەریکی بنیات‌نان‌و بەرگرین دژی دەست درێژی عەسکەری‌و دوژمنان ئەلێ :

**ڕیبازی ڕۆشنبیری کوردی لەپێشداو ئیستاش لە ناوەرۆك‌و ئاوات‌و لایەنەکانیا ڕیبازێك بو کە بە رۆحی نیشتمانی تێرو خەست کرابوو ئەمەش پەیتا پەیتا بەرزو پیرۆز ئەبێ نەك تەنیا لەو کاتەی کە هەستی نەتەوایەتی کورد دەرئەبڕێ بەڵکو ئەم سنوورەش رەت ئەکاو ئەشکەنجەو ئاوات‌و خەمەکانی ئەو کەسانەش دەرئەبڕێ کە لەم وڵاتەدا لەگەڵیا ئەژین‌و دژی ئیمپریالیزم‌و زایۆنیستەکان‌و کۆنەپەرستانن .** لێرەشدا ئەوەندە بەسە کە چەند ناوێکی گەش‌و زیندوو دەست نیشان بکەین کە لە بیری گەلێ لە ئەدیبە کوردو عەرەبەکاندان وەك ( گۆران ، بێ‌کەس ، کامەران

موکری ... ) لەسەر بەخشندەکانی ڕۆشنبیری کوردیو بۆ مەسەلەی نیشتمانیو وێژەیی ڕابەرن . هەروەها چەند ناوێکی لاوو هاوچەرخیش هەیە بە قوولی بۆ مەسەلەی نیشتمانیان نووسیوە بە هێزو بە ژیرییەوە لێی ورد بوونەتەوەو لە قاوغە گشتییەکەیەوە بۆ مەسەلە نەتەوایەتیەکە چوون .. بەڵام ئەبێ لەراستیەکی گرنگتر دڵنیایی بکرێ ئەویش ئەوەیە کە ڕۆشنبیری کوردی ، جیهانو لایەنی نەتەوایەتی تایبەتی خۆی هەیە ، ئەمەش بەرهەمی (تاکی)یەو لەبارو زروفی تایبەتی بوە ، ئەمەش ویژدانی میللەت دەرئەبڕێ ، وا ئیستاش دەنگی ئەشکەنجەو ئاواتو ئامانجەکانی نەتەوایەتیو نیشتمانێتی لەنێوان نوێیەکانیاندا .. دەنگێك کە بە قوڵیو بەراستی داخوازیەکانی نەتەوەی کورد دەرئەبڕێ دەنگێك کە بەرەو هاریکاری لە دروست کردنی دیموکراتی پێشکەوتنخوازیان ئەباتو مافی نەتەوایەتییان لە چوارچێوەی یەك وڵاتدا بۆ زامن ئەکا .

یەکگرتنی ڕۆشنبیرانی عەرەبو کوردو خەباتی ناوکۆیی نێوان گەلەکەمان پتەوتر دەکات ، چەند مەسەلەیەکی پەیوەندی هاوبەشی چارە نووسانە کۆمان دەکاتەوە ، بۆیە جێی سەرسوڕمان نیە ئەگەر هەڵوێستی ڕۆشنبیری کورد دەربارەی ئەو مەسەلانەی کە روبەروویان ئەبێتەوە لە ناوەوەی ئەو پەیوەندیانەوە هەڵقوڵابێ کە هەستو نەستە مرۆڤایەتییەکانی ئەتەقێنێتەوە ؛ پاشانیش ئەیخاتە چوارچێوە سەرەکییەکەیەوە بە چوار چێوەی چارەنووسی هاوبەش . ڕۆشنبیری کورد کاتێ کە لە چوارچێوەی ڕێبازی بەتەوژمی مرۆڤایەتی لە ژیاندا ژیاو زۆر چاك خۆی ناسیو ڕێگای ڕاستی خۆی دەست نیشان کردو لەخۆشیو ناخۆشیەکانی گەلدا بەشدار بو ، لەمەش زیاتر بە هوشیاریو ئاگادارییەکی قووڵەوە سەرکەوتنەکانی نەتەوەی عەرەبو مەسەلە نەتەوایەتیەکانی بەهی خۆی زانی ، ئەمەشی لە بەرهەمە ڕۆشنبیریەکانیا دەرخست بەمەش نیشتمان پەروەرێتی خۆی بەپیت کردو لەسەر ڕێبازی پێشکەوتنخوازو دیموکراتی ڕۆیشت کە ڕێبازی هەموو ئەو کەسانەیە کە ئاواتو ئامانجی هاوبەشو بەجێو ئاواتی پیرۆز کۆیان ئەکاتەوە .

ڕۆشنبیری کوردی بەو پێیەی کە وشەی کوردی پیرۆزی ئەڕژێتە ڕێبازی کاری تێکۆشانی پێشکەوتن خوازەوە بەپاکی خۆی پاراستووە . بەو پێیەی کە ڕۆشنبیری کوردی بەشێکە لە ڕۆشنبیریی نیشتمانیو لەبەرییەکەوە لکانی تێکۆشانی هەردو نەتەوەی کوردو عەرەب لە وڵاتی عیراقداو بەرەو جێبەجێ کردنی

# یەکگرتنی ڕۆشنبیرانی عەرەب و کورد خەباتی ناوکۆیی نێوان گەلەکەمان پتەوتر دەکات

داخوازیەکانی قۆناغی شۆڕشگێڕانەی ئیستا .. ئەبێ هەوڵ بدەین تا بەپتەوترین شێوەی یەکگرتنی ڕۆشنبیرە کوردو عەرەبەکان جێبەجێ بکرێو هەوڵ بدرێ بۆ قوڵکردنەوەی دەس[illegible]تە ڕۆشنبیرییەکانی گەلی کوردمانو پەرە پێدانی [illegible]بو کەلەپووری نەتەوایەتی ، ئەو دەسکەوتانەی کە [illegible]پۆرتی سیاسی کۆنگرەی قوتری هەشتەمی پارتی بەعسی عەرەبی سوشیالیستو ئەو بڕیارانەی کە لەلایەن سەرکردایەتیی سیاسییەوە بڕیاریان لەسەردرا ، بەم پێیەش باشترین (کەش) بۆ پێشخستنو گەشەکردنی ڕۆشنبیری کوردی دروست بوو وە ئەتوانرێ هاوشانی دەسکەوتە نیشتمانیەکانی گەلەکەمان بڕوا .

پردە ڕۆشنبیریەکانمان لە پێناوی گەشە کردنو پەرەسەندنی وڵاتدایە .. لە پیشاندانی بیری پێشکەوتوو شۆڕشداو سەرکەوتنی ئۆردوگای میللەتان لەجیهاندا .

**مامۆستا غەفور میرزا کەریم ئەمە ئەچەسپێنێ :**

جەماوەری کورد پاش ئەو ژانو جەزرەبە پڕ لە ناخۆشیو بەربەرەکانێ تاڵو درێژ خایەنە خۆی سەرپەرشتی قۆناغی ڕۆشنبیری ئیستای خۆی ئەکاتو ئەتوانێ ڕۆشنبیرییەکی پێشکەوتنخواز بۆ خۆی پێك بێنێو کەلەپوری نیشتمانی زیندو بکاتەوە ..

ماوەیەکی زۆر بەسەرچو پێش ئەوەی ئەم گەلە خاوەنی سامانی ڕۆشنبیری خۆی بێ ـ کە ڕۆڵەکانی شانازی پێوە ئەکا ـ چونکە ڕۆشنبیری نیشانەی پێشکەوتنیانو بەردی بناغەی دروست کردنی برایەتی خۆشیو جێی بەیەك گەیشتنی ڕۆشنبیری کوردیو عەرەبییە .

ڕۆشنبیری کوردو ڕۆشنبیرە نیشتمانیەکانیتری عیراق لە هەموو قۆناغەکاندا ئەوپەڕی توانای خۆیان لە پێناوی دروست کردنی ئەم پردە ڕۆشنبیرییەدا خستۆتە کار لەپێناوی گەشە کردنو پێشکەوتنی گەلی عێراقدا بۆیە هەستمان بە قوڵی ڕەگو ریشەی دروشمی

> **مامۆستا غەفور میرزا کەریم :**
> ئاواتە هاوبەشیەکانی رۆشنبیرانی عیراقی بەشێوەیەکی گشتی وا لە رۆشنبیرانی کورد کرد کە گەلێ بەرهەمی رۆشنبیریانەی لەپێناو مەسەلەی برا عەرەبەکانی و تێکۆشانیان بێت .

برایەتی کوردو عەرەب کرد بەشێوەیەك کە هیچ هێزێکی ئیمپریالیزمو کۆنەپەرستی نەوێرێ زەفەریان پێ بەرێت .

پەیوەندی رۆشنبیری نێوان هەردوو نەتەوەکە پەیوەندیەکی بنەڕەتی مێژوویەو لەپێناوی نیشتمانو ئەم دوو گەلە برایەدا بەیەکەوە لکاوە . بەپێویستی ئەزانین کە رۆشنبیرەکانمان توانای خۆیان زیاتر بکەن بۆ ئەوەی بەباشترین شێوە دەورە مێژوویەکەی خۆیان لە پێشخستنی رۆشنبیری نیشتمانی لەم قۆناغەدا ببینن کە هەموو بیرو رێبازێکی دواکەوتوو کۆنەپەرستانە بەرانبەر ئەم رۆشنبیری‌یە نوێیە خۆی ناگرێ کە دوای شۆڕشی ١٧ــ٣٠ی تەمووزی نەتەوایەتی پێشکەوتنخواز کە ماوەی لەبەردەم رۆشنبیرە کوردەکاندا کردەوەو زەمینەی بەپیتی داهێنانی بەربەرینیان بۆ داهێنان لە پێناوی دروست کردنی عیراقێکی نوێی خاوەن رۆشنبیرێکی سوشیالیستی یەکگرتو .

## * پشتەمای سیاسی رۆشنبیری نیشتمانیمان ..

**ئەگەر لە قۆناغەکانی تێکۆشاندا سەرنجێکی وردی مێژووی گەلی عیراقمان بدەین چەند لاپەڕەیەکی چریسکەداری کۆششی قارەمانێتی هاوبەشی کوردو عەرەب ئەبینین .**

بەپێی ئەم دەست نیشان کردنە وردە **مامۆستا محمد بدری** پشتەمای رامیاری بۆ پێکەوە ژیانی رۆشنبیری کوردی‌و عەرەبی‌و یەکگرتنیان لە رۆشنبیری نیشتمانی هاوبەشدا وێنە ئەکێشی‌و ئەڵێ : **ئەم پێکەوە ژیانە هاوبەشەو ئەم گیانە پتەوەی برایەتی‌یە یەك رۆشنبیری نیشتمانی پێك هێناوەو ئەو رۆشنبیری‌یەی کە هەموو جۆرەکانی ئەدەبو بابەتە شارستانیەکان ئەگرێتەوەو سیمای برایەتی‌و ئاشتی‌و پەرەسەندنو خۆشەویستی پێ ئەبەخشێت .**

رۆشنبیری نیشتمانی پێویستی گەشە کردنو پێشکەوتنی خۆی لە تێکۆشانی گەلی عیراقەوەو رێبازی ژیانو بیروباوەڕو ئاواتو ئامانجەکانیەوە وەرگرتووە ئەمەش شێوەیەکی وا چاكو گونجاوی لێ‌دەرچو کە لەگەڵ ئەدەبو رۆشنبیری‌و ئاواتو ئامانجەکانی هەموو نەتەوەکانو کەمایەتیەکانی‌تری گەلی عیراقدا بگونجێ‌و یەك کار بکاتە سەر ئەوی‌ترو هێزو پێشکەوتنو پەرە پێدانی لەوەی‌ترەوە وەربگرێ .

ئاواتە هاوبەشیەکانی رۆشنبیرانی عیراق بە شێوەیەکی گشتی وای لەرۆشنبیرانی کورد کرد کە گەلێ بەرهەمی رۆشنبیریانەی لە پێناوی مەسەلەی برا عەرەبەکانو تێکۆشانە بەجەرگەکەیان بێ‌و لەپێناوی سەندنەوەی مافو رزگار کردنی زەوی‌یە داگیرکراوەکانیا دابێ چونکە ئەم مەسەلەیە بە هی خۆیان دائەنێن .. ئەم ئاواتانەش وای لە رۆشنبیرە عەرەبەکان کرد کە لەگەڵ ئاواتو ئامانجەکانی برا کوردەکانیان دابن . ئەوانیش بۆ کوردستانو مافی نەتەوایەتی‌ی گەلی کورد گۆرانییان وت ، چونکە ئەم گەلەیان بە بەشێك لە گەلی عیراق دانا کە یەك ئاواتو یەك دواڕۆژ کۆیان‌ئەکاتەوە .

راستە کە رۆشنبیری کوردی کەلەپوری تایبەتی‌و شێوەیەکی جیاوازی خۆی هەیەو بەدرێژایی قۆناغەکانی ژیانی مێژوویی گەلەکەی لەگەڵیا دروست بووە ، بەڵام ئەو گۆڕانەی قۆناغی ئێستا بەرەو بەکارهێنانی رۆشنبیری بەگشتی لەپێناوی بنیاتنانو دروست‌کردنی پیشەسازی‌و گەشەکردنی کۆمەڵایەتی ( پێویستی ) یەکخستنی رۆشنبیری هەموو گەلی عیراقمان لەلا پێویست ئەکات .

بەو هەموو لایەنە تایبەتیە نەتەوایەتیانەی کە هەیە ئەبێ پێ لە پاڵ پشتی کردنو دەوڵەمەند کردنی ئەم لایەنانەدا بگیردرێ‌و بۆ مەیدانی رۆشنبیری نیشتمانیش بەرزترین پایەی پێکەوە لکانو گونجانو یەکگرتنی بنەڕەتی زامن بکرێ .





# سەدەی سینەمای ئیتالی

عەبدولعەباس

لە سەرەتای ئەمساڵدا ، هونەرمەندی گەورەی ئیتالیایی « جیان ماریا فولنتی » گەیشتە وڵاتی کۆبا ، بەر لە ڕۆشتنی پروپاگەندەیەکی زۆر بۆ ناسینی فلیمەکانی « ماتی »و « جیور دانو برونو »و « چینی کرێکاران ئەچێتە بەهەشت»و «کوشتن» کرا، ئەوی ڕاستی بێ لە ماوەی بەرهەمەکانی «فولنتی»یەوە

# داهاتووی وزە لە جیهاندا

ماوەی سێ ساڵە وڵاتانی بەرهەم هێنەری نەوت لەو باوەڕەدان کە پێویستەنرخی نەوت بچێتە سەرو لە وماوەیەشدا دەوڵەتانی بەکارهێنەر بەردەوام بەرهەڵستی ئەو بیروڕایەیان کردوە و زیادکردنی نرخی نەوتیان بە هەڵەزانیوە .

لە چەند مانگی داهاتودادنیا زۆر باسی نەوتو نرخی نەوت دەکا ، بەتایبەتی پاش کۆنفرانسی شیمالو جنوب بۆ لێکۆلینەوەی کەرەسەی خاوو کەلوپەلی پیشەسازی دەوڵەتە پێشکەوتووەکان کە لە پاریس بەسترا . ئەمە یەکەم جار بو کە کۆبوونەوەیەکی جیهانی لە بارەی ئەو مەسەلەوە پێك هاتو هەموو لایەنەکان بەرەو ڕووی یەکتر لەسەر مێزی وتووێژ دانیشتن .

ئیستا دنیا چاوەڕوانی کۆبوونەوەی ڕێکخراوی ئۆپێکە کە بڕیار وایە لە «بالی» ببەسترێ . ئەو کۆبوونەوەی وەزیرانی نەوتی وڵاتانی بەرهەم هێنەری نەوت بە کۆبوونەوەیەکی مێژوویی دادەنرێ ، پاش ئەوەی کۆبونەوەی ڕابردویان لە ڤیەننا بەبێ گەیشتنە ئەنجام بڵاوەی لێکرا ، ئەویش لەبەر ئەوەی پەلامار دراو مەترسی مردن هەڕەشەی لێ کردن .

کۆبوونەوەی « بالی » کەندوکۆسپی زۆر لەپێشە، چونکە بەشێك لەئەندامەکان داوا دەکەن کە بۆ بەربەرەکانێی ئاوسانی دراو (التضخم النقدی) نرخی نەوت کەم بکرێتەوەو بەشێکیش سوورن لەسەر ئەوە کە نرخی نەوت بەردەوام بچێتە سەر .

دەوڵەتانی بەکار هێنەری نەوتیش خۆیان بۆ کۆبوونەوەیەك ئامادە دەکەن کە لەومەسەلەیە دەکۆڵێتەوە

ئەتوانرێ باسی « سینەمای سیاسی » بکرێ .

« فولنتی » هونەرمەند بو بە پاڵەوانێکی میللی لە ناوەوەو لە دەرەوەی وڵاتەکەی ، ئەمەش قسەی ڕۆژنامە نووسێکی کوبایە لە گۆڤاری « سینی کوبانۆ »دا، ئەم قسەیە دەربارەی «فولنتی» لە خۆیەوە نەهاتووە ، بەڵکو ڕاستییە ، لە بەرهەمەکانیا وێنەی ئەو مرۆڤانە نیشان ئەدات کە گیانی بەربەستی‌و تێکۆشان لە خۆیاندا پەروەردە ئەکەن پاڵەوانێتی لە هەوڵی ڕۆژانەوە پێ‌ئەگەیەنێ‌و بە گژ چەوسانەوەدا ئەچێ‌و لەگەڵ جەماوەردا ئەبێ .

لە بەرهەمی ئەم هونەرمەندە ، دوا فلیمێتی کە لە مەکسیك گرتویێتی‌و بە هاوکاری لەگەڵ دەرهێنەری شیلی « یجیل لیتین » بە ناونیشانی « دەفتەری ماوتسیا » کە وێنەی تێکۆشانی شۆڕشگێڕانەی کرێکارانی کانەکانی شیلی لە ساڵی ١٩٠٩دا دژی کومپانیاکانی بەریتانیا نیشان ئەدات .

پێشەوازی گەرمی فلیمەکانی « فولنتی » لە هەر وڵاتێکدا نیشان دانی ڕێزە بەرامبەر دەوری سینەمای سیاسی‌و ئەو کارە گەورەیەش ساغ ئەکاتەوە کە ئەم جۆرە فلیمە ئەیکاتە سەر ژیانی هاوچەرخی گەلانی دنیا .

« فولنتی » لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامە نوسیدا وتویە ئەو ئەکتەرانەی (ممثل) کە تەنیا دەوری « ڕابواردن » لە سینەمادا ئەبینێ ، بووکە سەما کەرەن بۆ پێکەنین‌و کات بردنە سەر ، بە لای منەوە «ئەکتەر»ی سەر بە میللەت پێویستە ئەو دەورانە ببینێ کە ژیانی ڕاستەقینەی خەباتی جەماوەر نیشان ئەدات . هەروەها وتویە « کاتی ئەوە هات سینەما لە چوارچێوەی بۆرجوازی‌و خزمەت کردنی تەنیا ئەو چینە ڕزگار بکرێ ، پێویستە فلیمی وا دروست بکرێ کە خزمەتی گەل بە گشتی‌و چەوساوەی گەل بەتایبەتی ئەکات . ئەو فلیمانەی کە باری ڕاستی ژیانی سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی خەڵك لەم چەرخەدا نیشان ئەدات .

بەرهەم هێنانی فلیمی ڕاستەقینە لەلایەن هونەرمەندە پێشکەوتو خوازەکانی دنیاوە ، بۆتە ئامانجێکی بەرزو بۆی تێ‌ئەکۆشن ، ئەکتەری ئەمریکایی «کانەیس برجن»و «روبرت شنایدر» فلیمی « دڵو ژیر »یان بەرهەم هێناو کومپانیا سەرمایەدارەکانی ئەمریکا زۆر کۆسپیان خستە ڕێگای ئەم فلیمە ، بەڵام هەر خۆی سەپاندو هەتا پاداشتی « ئوسکار »یشی پێ‌درا، هەروەها دەرهێنەری ناسراو «فرانسیس فۆرد» فلیمی « باوکی گیان»و «گفتوگۆ»ی بەرهەم هێناو یەکێ لەم فلیمانە لەشەڕی ڤێتنام ئەدوێ ، بەڵام لەگەڵ تەواو بوونی شەڕەکەشدا هێشتا نیشان دانی لە ئەمریکا قەدەغەیە .

---

ئاخۆ جیهان لە دە ساڵی داهاتودا چەندەی پێویستی بە وزە (الطاقە) هەیە . هەر وەك لەمەوبەریش کۆبوونەوەیەك لە نێوان ئەمریکاو ژاپۆن‌و بازاڕی هاوبەشی ئەوروپاو ئاژانسی جیهانی وزەدا بۆ ئەو مەبەستە بەستراو دەوڵەتی سعوودی بە نوێنەرایەتی ڕێکخراوی ئۆپێك تێیدا بەشدار بو .

ئێستا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە : دنیا لە ساڵێ‌دا پێویستی بە نەوت چەندە ؟ ئەگەر نەختێك بەرەو دوا بگەڕێینەوە دەبینین ڕادەی کڕینی نەوت لە لایەن وڵاتانی بەکار هێنەرەوە ساڵی ٩٧٤ وەك خۆی مایەوە ، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٥دا زۆر هاتە خوار . کەچی ئەم‌ساڵ دەبینین پێویستی دنیا بە نەوت ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد دەکا زیاتر نەوت لە دەرەوەڕا دەچێ بۆ وڵاتانی بەکارهێنەر ئەمە دەری دەخا کە بیرو ڕای وڵاتانی بەرهەم هێنەری وزە ڕاست بووە ، چونکە لێکدانەوەکەیان لە ساڵی ١٩٨٥دا دێتە دی . لە کاتێکدا وڵاتانی بەکار هێنەر دەبێ دان بەوەدا بنێن کە لێکدانەوەکەیان ڕاست دەرنەچووە ، ئەوان لایان وابو ڕادەی هێنانی نەوت لەدەرەوە لەساڵەکانی حەفتادا لە جێگای خۆی ڕادەوەستێ‌و هیچ زیاد ناکاو لە ساڵی ١٩٨٠ش بەولاوە زۆر دێتە خوار .

نەخشەی دەوڵەتانی بەکار هێنەر بۆ سەری نەگرت ؟

وەڵامەکەی زۆر ئاشکرایە وڵاتە یەکگرتووەکان گوێ‌ی نەدایە بەرنامەی دەوڵەتانی بەکارهێنەرو بەردەوام نەوتی دەرەوەی کڕی . ئێستا ئەو نەوتەی لە دەرەوەی دەکڕێ لە سەدا چلی ئەو نەوتەیە کە لەناوخۆدا بەرهەمی دێنێ‌و لەساڵی ١٩٨٥دا دەگاتە سەدی پەنجای بەرهەمی ناوخۆ ئەم زانیاریانە لە سەرژمێری‌و ئەژمارەکانی کومپانیای ئاکسۆن وەرگیراون .

شتێکی تازە ئەوەیە کە ئەمریکا لە مانگی ئازاری ڕابردودا پتر لە بەرهەمی ناوخۆی نەوت لە دەرەوەڕا هێناوە . ئەم مەسەلە زۆر گرنگە . چونکە نیشانەی ئەوەیە کە سەرمایەداری ئەمریکا وای بە باش زانیوە لە جیاتی ئەوەی پارەکانی لە پرۆژەی دۆزینەوەی وزەدا بخاتە کار ، نەوت لە دەرەوە بکڕێ .



# ئادەمیزادی ئێستاو کانەکان

عەبدوللا زەنگنە

کانەکان بەردی بناغــەی شارستانێتی ئێـــستامان ، رۆژ بە رۆژ ئادەمیزاد زیاتر پێویستی بەکەرەسەی خاوی کانەکان ئەبێــت ، ئاســن‌و پــۆلا گـــەلێ چــیرۆکی رۆمانتیکیمان دەربارەی ئەم کانانە بۆ ئەگێڕێتەوە .

لــە ســـــالی ١٨٠٠دا بەرهەمی کانــەکان لە ٥٠٠ هەزار تــۆن تێناپــەری ، چونکە خەڵکی هێشتا زیاتر هەر لە خانــوی ســـــادەو ئاسان دروســـت کــراودا ئەژیان‌وگالیسکەو عەرەبانەی دارینیان بەکار ئەهێناو .. رســـتن‌و چنــین هەر بــە دەست‌و ئامێری دەستکــرد پێــك ئەهێنــراو ، تــۆو شۆویش هەر بە شێوە دوا کەوتــووە ئاساییەکەی لای خۆمان جێ بەجــێ ئەکرا ، نــەك وەکـــو ئێســـتا لــە کۆشکی چەند نهۆمدا بژین‌و جۆرەها ئۆتۆمبیل‌و مەکینە هەبێــت بۆ هــەر کارێــك بتەوێ جێ بەجێی بکەی .

ئادەمیزاد لە سەدو پەنجا سالی رابــوردوودا گــەلێ سەرکەوتنــی مــەزنی لــە کۆڕی زانست‌و تەکنەلۆژیاو پیشەســازی‌دا بە دەســت هێناوە . رێــگای ئاســن‌و کارەبا زۆر بەشـــی تاریکی ئەم‌جیهانەی رۆشن کردەوەو بەدنیای شارستانێتی‌یەوەی بەستەوە .. تەنها ولاتەکەی ئێمە نەبێت کە هەر مایەی ئاهو حەسرەتی شاعیرانمان بووە ، مــەگەر ئەم چەنــد سالەی ئەم دواییە نەبێت .

کەشتی‌یـــە پۆلاییـــنە گەورەکان دەریایان لەپاپۆڕو بەلەمە بچــووکەکان کــردە کونە مشك‌و رەویان دانــە کەنارەکانەوە ، فڕۆکە تــیژ ڕەوەکانیش تەختی سینگی ئاســـمانیان کـــردە کاروان ســـەراو بە بــاری پەنجــا تۆنی‌یەوە فڕکان فڕکانیانە .

خۆ تەشی‌و تیرۆك‌و نــاو برێشك‌و داس‌و داسولکەو قەلانگ‌و هەوجاڕو خەنجەرو مەلاغان‌و شــەکر شکێــن مەگەر هــەر لــە عەنتیــکە خانەکانی جیهان‌وکوردستانی ئێمەدا ببینرێن ، لە کاتێکا ئادەمیــزاد هـــەر ئــەو ئادەمیزادەیە کە دەستکردە پۆلایینە زەبەلاحەکانی خۆی بۆ سەر مانــگ‌و پشکنینی هەموو کون‌و قوژبنێکی ئەم گەردوونـــە فراوانـــــە ئەنێرێت .

ئەو هەمــوو پێشکەوتنە هەروا بە ئاسانی نەبووە ، بەکارهێنانی چوار ملیۆن تۆن لە بەرهەمی کانەکان تەنیا لە ئامێــر وخانــوو بــەرەدا ، بەکارهێنانی بیرو ئیشکردنی ئەوێــت‌و ، جوولانـــەوەو هیممەت .

ئەمە ئەمــڕۆو دوێنێ ، ئەی ســبەینێ چیمان بــۆ دێنێ ؟!

پلاستیك گەورەتریــن‌و وانتـــرین کەرەســەی پێویـــستی ســـبەینێی ئادەمیزادەو ، رەنگە گــیرو گرفتی کەم بوونەوەو نەمانی کەرەسەی خــاوی کانەکان بەمــە چارەسەر بکــرێت‌و پیشەسازی لــە بەردەوامی خۆی نەکەوێت .

بەلام تا ئێستاش کانەکان بناغـــــەی پێشـــکەوتنی تەکنەلۆژیای ئەمڕۆمان .

---

بۆ نووسینی ئەم باســە سوود لە(المعادن والانسان)ی م ــ ڤاسیلیف وەرگیراوە .

# داهاتوی وزە لەجیهاندا

لەلایەکی‌ترەوە دەری‌دەخاکــە وتووێژی دەولــەتانی شیمال‌و جنوب لە بــارەی‌نرخی نــەوت‌و بەربەرەکانی چونە سەری نرخی نەوتەوە،لە نێوان سالەکانی ١٩٨٠ ــ ١٩٨٥دا سەدی سەد تــێ‌دەشـــکێ . کــــە وابــو لێکدانــەوەکانی ڕۆژئـــاواتوشـــی هێنــدێك تەنــگ‌و چەلەمەی ئەوتۆ دەبن کــەناتوانن چارەسەریان بکەن . وەك لە بیرمانە وەختێکیش هەرەشــەیان لــە ولاتــانی بەرهــەم هێنــەر کرد کــەپارەیەکی زۆر دەخەنە کــار بۆ ئەوەی سەرچاوەی تــازەبـــۆ وزە بدۆزنــــەوەو پێویستی‌یان بـــە نــەوت نەمێنــێ . کــەچی بــۆیان دەرکەوت ئەگەر بشــتوانن شتێکی بەکەلــك بدۆزنەوە زۆریان بە گران لە ســەر دەوەستێ .

ئێستا ڕۆژ بە ڕۆژ ئــەو نیگەرانیە زیــاد دەکات کــە نەتوانن سەرچاوەیەکی‌تری وزەبدۆزنەوە. وەك دەزانین بە دەست هێنانی وزە لــە تیشکی ڕۆژ سەری نەگرت‌و لە ئال‌و گۆڕەکانی ئەتۆمیش هیــچ بەرهــەمی نەبــو . هەروەها دەرکەوت وزەیەك کە لە تێکەڵ کردنی غــازو خیزی گەرم بەدەست دێ ، دوو هێندی نرخی نــەوتی تێ دەچێ .

ئەگــەر بیانــەوێ لەگەل ولاتانــی خــاوەن نـــەوت هــاوکاری نەکــەن تەنــیا سەرچاوەیەکی وزەیان بـــە دەستـــەوە ئەمێنــێ کـــە



# نـەوت لـە مێـژودا

## نەوت ( النفط ) لە مێژوودا

**کەمال جەلال غەریب**

نـەوت لـە زۆر کۆنـەوە ناسـراوە ، چونـکە ئێرانی‌یەکان چەند هەزار ساڵێك لەمەوپێش ئاگرەکەیان پەرستووە ، هەروەها نەوت لە گەلێك کتێبی مێژوویی‌و ئایینیی کۆندا باس‌کراوەو ، لە ناوچەی ( باکۆ )دا لـە سەدەکانی ناوەڕاست‌دا ناسـراوە . بەڵام ئادەمـیزاد بەتـەواوی لە سـاڵی (١٨٥٩)ی زایینی‌یـەوە بـۆی دەرکەوتووە کە نەوت ماددەیەکی زۆر بەکەڵکەو هـەر لەو ساڵەشەوە لەشاری ( پەنسلڤانیا )دا بەکارهێنراوە بۆ ڕووناك کردنەوەی ناو شار . بەڵام ئێستاکە نـەوت بریتـی‌یە لـە شـادەماری پێشـکەوتنی ئادەمیـزادو گەورەترین هۆیـە بۆ بەڕێـوەبردنی فـڕۆکەو پاپۆڕو ئۆتۆمۆبێل هەروەها بۆ پەیداکردنی هێـزی کارەباو بۆ چەور کردنی مەکینەو دروست کردنی بۆیەو دەرمان .

**نەوت چی‌یەو لە چی پەیدا بووە**

وا دیارە کە وشـەی نەوت (نفط) لە وشـەی (نافثا)ی گریکی‌یەوە هـاتووە ، هەندێـك ئاوێتەی ئـۆرگانیکی (مرکبات عضویة) هەن کە (نافثینەکان)یان پێ‌ئەوترێت‌و لە پێکهاتنی نەوتی سروشتی ( النفط الطبیعی)دا هەن .

هـەروەها وشـەی پیتـرۆل ( بتـرول ) بریتی‌یە لە خەڵووزی بەردو دیـارە ئـەو لە نـەوتیش هەرزانتر تـەواو دەبـێ . بەڵام داخوا تـا چ ڕادەیەك دەتوانن لەو ڕێـگایەوە وزە بەدەست بێنن‌و لە کەیـەوە دەتوانن دەست پێ بکەن ؟ ئەمە پرسیارێکە کە هیـچ کەسـێ ناتـوانێ وەڵامـی بداتەوە .

لەبـەر هەمـووی ئـەو ڕاستەقینـانە دەوڵـەتانی بەرهـەم هێنـەری نـەوت دەتوانن بە بڕوایەکی پتـەو بە ڕاستی‌و دروستی بیـرو ڕاکانی‌خۆیانەوە لەکۆبونەوەو کۆنفرانسـە جیهانیـەکاندا بەشدار بن‌و داخوازیەکانیان بەسەر وڵاتانی بەکارهێنەردا بسەپێنن . لەوەش زیاتـر دەتوانن داوا لەو وڵاتانـە بکەن کە پارەی خۆیان بـۆ دۆزینـەوەی سـەرچاوەی تـازەی وزە بـخەنە کار ، چونکە زەخیرەی نەوت لـە جیهاندا ئەوپەڕەکەی تا چل ساڵی دیکە تەواو دەبێ .

بەم جۆرە دەگەینە ئـەو ئەنجامە کە لە جیاتی ئەوەی وڵاتانی بەکار هێنـەر بیـرو ڕای خۆیان بەسەر وڵاتـانی بەرهەم هێنەردا بسـەپێنن ، ئەمـان دەتوانن پێ لەسـەر داخوازەکانیان بچـەقێنن . کەواتە دەوڵەتانی بەرهـەم هێنەر لەدوو لاوە قازانجیان کـردوە : لـە لایـەك لێکدانەوەکانیان سەدی سەد ڕاست دەرچووەو لە لایەکی تریش بیروڕای وڵاتانی بەکار هێنەر ڕاستە بەڵام نەك بۆ بەربـەرەکانی‌و بەرهەڵستی دەوڵەتانی بەرهەم هێنەر ، بەڵکو بـۆ ئەوەی بـیرێکی کاریگەر بۆ داهاتووی وزە لە هەموو جیهاندا بکرێتەوە .

واتا نەوتی سروشتی وشـەیەکی گریکی‌یەو لـە دوو بـرگە پێـك هاتووە یەکەمیـان ( پێترۆ ) واتا بەردو دووەمیان (ئۆلیۆم) واتا ڕۆن ، کەوابوو مانای وشەی پێترۆل یان پێترۆلیۆم (ڕۆنی بەرد) ئەگرێتەوە . چونکە نەوتی سروشتی لـە بەردی تایبـەتی‌دا هەیەو دۆزراوەتـەوە .. **نەوتی سروشـتی لە ماوەی چەند مەتریکەوە هەتـا ( ٣ ) میل لە ژێـر زەوی‌دا دەبێت‌و چۆنێتی‌ی نـەوتەکە لەسـەر سروشـتی زەوی‌ی ئەو ناوچەیە وەسـتاوە کە تیایدا پەیدا دەبێـت . نەوتی سروشتی شـلەیەکی قـاوەیی مەیلـەو ڕەش‌و سـەوز ئەنوێنێت ، کاتێـك کە تیشکی خـۆر ڕەتدەکاتەوە . کێشی هەر یەك سانتیمەتر شەش پالۆو ( سێ جا ) لە نەوتی سروشتی دەکاتـە (٧٦ر٠ ـ ١) گرام لـە پلەی گەرمی (١٤)ی سانتیگرادا** . نەوتی سروشتی تەنهـا یەك مادده نیە بەڵکو تێکەڵاوێکە لە چەنـد ماددەیەك ، بـە زۆری لـە هایدرۆکاربـۆن واتـا ئاوێتـەیەك لە هایدرۆجـین‌و کاربـۆن پێك‌هاتبێت )و ئەمانەش لە شێوەی گاز یان شـلە یان ڕەقدان ، بـە کوڵاندن‌و سارکردنەوە لەیەکتری جیادەکرێنەوە . ئەم هایدرۆکاربۆنانە زۆریان لە شـێوەی (ئەلیفاتیك) واتا چـەوری‌و مـۆمدا ئەبـن‌و کەمێـکیان لـە شـێوەی ( ئەرۆماتیـك ) واتـا عەتـردا ئەبـن . ئەلیفاتیکەکان زۆریـان تێرن (مشبع) بـە هایدرۆجین‌و کەمێکیشیان نیمچە تێرن . جگە لەمانە نەوتی سروشتی گەلێك ماددەی‌تریشی تیادایە وەکو ترشەڵۆکی (ترشی) ( نافتین و ستیرین و ستیرۆڵ و هۆرمۆن و کلۆرۆفیل و هیمین ) . لە هایدرۆکاربۆنە ئەرۆماتیکی‌یەکانیش ماددەی ( بەترول و تلـۆك و زلـۆل و فەنـۆل ) جارجـاریش هەندێکی زۆر کەم لە چەند کانزایـەکی (معدن) وەکو زێڕو زیوو مس‌و نیکل‌و ڤانادیۆمی .... تیادایە .

**لە ئەنجـامی شی‌کردنـەوەی تـەواوی نـەوتەوە دەرکەوتووە کە بریتی‌یە لە ٨٣ـ٨٥ر٪ کاربۆن ، لـە ١١ـ٢ر١٤٪ هایدرۆجـین‌و ، میقداریکی زۆر کەم لە ئۆکسجین‌و نایترۆجین‌و گۆگرد . نەوتی پەسەند کراو ئەو نەوتەیە کـە میقداریکی زۆر کەم لـە نایترۆجین‌و گۆگردی تیادابێت ، چونکە ئەگەر هات‌و نەوت لە ٢٪ لەم دوو ماددەیەی زیاتر تیابێت ئەوا پالاوتنی گـران دەبێت .**

**لە ڕووی ئابووری‌یەوە نەوتی سەرزەمین دەکرێت بە چوار جـۆرەوە بە پێی ئـەو هایدرۆکاربۆنانەی کە تیایەتی‌و کار ئەکەنە سەر قورسی‌و سووکی‌ی نەوتەکە :**

**ا ـ نەوتی پارافینی : ئەمە سووکە وەکو نـەوتی مەکسیك .**

**ب ـ نەوتی قیراوی : ئەمە قورسـە وەکو نەوتی باکۆ .**

**ج ـ نەوتی نافتینی : ئەمیش هەر قورسە .**

**د ـ نەوتی تێکەڵاو : ئەمـە تێکەڵاوە لـەو سێ جۆرەی کە لەسەرەوە باسمان‌کردن وەکو نەوتی عیراق‌و ئەمەریکا .**

★

### نەوت چۆن پەیدا بووە

زاناکان لەسەر چۆنێتی پەیدا بوونی نەوت ڕێك نەکەوتوون . هەندێکیان ئەڵێن نەوت ڕەگەزێکی کانزایی (معدني) هەیە ئەم بیروڕایەش پێی دەوترێت ( تیۆری کانزایی ) واتا ( النظرية المعدنية )و بەم جـۆرە لێکی دەدەنەوە : مـاددەی (کالسیۆم کاربايد) لەگـەڵ ئاودا کارلێك دەکات‌و مـاددەی (ئەسیتلین) پەیـدا دەبێت ، ئنجا هەر سێ بەش لە ماددەی ئەسیتیلین لەناو خۆیاندا یەك ئەگرن‌و ماددەی (بەنزۆل) پێك‌ئەهێنـن ، ماددەی بەنزۆلیش یەکێکە لەو ماددە گرنگانەی کە لەناو نەوت‌دا هەن . بەڵام زوربەی زاناکان بەم بیروڕایە قایل نین .

دوای ئـەوە بیروڕایەکی‌تـر هاتۆتە کایـەوە کە ڕەگەزی نەوت ئەگەڕێنیتەوە سەر گیاندار (الحيوان)و ڕووەك (النبات)و پـێی ئەوترێت (تیـۆری ئۆرگانیکی) واتا « النظرية العضوية » . ئەم تیۆری‌یەش دوو لقە : لقی یەکەم ئەڵێت نەوت لە ڕووەك پەیدا بووە بـەوەی کەوا هەندێ جار لە نزیك بیری نەوت‌دا خەڵوز هەیە . بەڵام زاناکان لە ماوەی (٤٠) ساڵ لەمەوبەرەوە وازیان لەم تیۆری‌یە هێناوە ، چونکە وادەرکەوتووە کە مەرج نیە لە ناوچەیەکدا خەڵووز هەبێت نەوتیش هەبێت . لەبەرئەوە ئێستاکە باشترین تیۆری بـۆ لێك‌دانەوەی چۆنێتی‌ی پەیـدابوونی نـەوت ، ئەو تیـۆری‌یەیە کە ڕەگەزی نەوت دەباتەوە سەر گیاندار ( لقی دووهەم ) : **ئەم بیروڕایە وامان بۆ دەردەخات کـەوا ئەو ملیۆنـەها ماسی‌و گیاندارانەی‌تری وەکوو گیانداری ( فۆرامنیفیرا ) کە لە دەریاکاندا ژیاون‌و ئەژین ، دوای مردنیان بەسەر یەکتری‌دا کەڵەکەبوون‌و بوونەتە بەرد ، ئـەم بەردەش لەگەڵ ئـاودا تێکەڵاو بووەو بەهـۆی قورسایی ئـەو زەوی‌یەوەی کە لـە سەریانەو بەهـۆی گەرمی‌یەوە ، ماددەیەکی ڕەش‌و گازیان لێ‌پەیدا بووە .**

ئەم ماددە شلە ڕەشەش نەوتە . لەبەر ئەوە زۆر جار پەیکەری ئـەو گیاندارانـە لەنەوت‌دا بینـراوە ، بەتایبەتی لەنەوتی عیراق‌و ئەمەریکادا . هەروەها بوونی ماددەی (کالسیۆم فۆسفەیت)و (کالسیۆم سۆلفەیت) ، ئەو دوو ماددەیەی کە لە ئێسقانی گیانـداران هەن لە

←

## ئافرەت و سەربەستی

ئانیا قادر حاجی حوسێن

ئافرەت که ئەم بەشەزۆرەی کۆمەڵ بێ ، ئەبێ بەو پێیەش سەربەستی‌هەبێ‌و لەگەڵ پیاوا جیاوازی نەبێت‌و ڕێگای کارکردن‌وچوونە ناو کۆمەڵی لەبەردەما بکرێتەوە ، ئەو بیرو باوەڕەڕزیوانەی ئافرەتی لەناو چوار دیواردا بەستۆتەوە[illegible]گیان لەبەرێکی بێ‌فەڕو کەم نرخی ئەزانێت پووچ‌بکرێتەوە چونکە نرخ دان بە ئافرەت مرۆڤایەتی‌وپێشکەوتنی کۆمەڵەو ، ئادەمیزادی نوێ لـ[illegible]ەربەستی‌ی ئافرەت ناترسێت ، چونکە باوە[illegible] بە خۆی‌و بە ئافرەتیش هەیە .

تا ئێستاش لەکوردستاندا خێزانی وا هەیە تەنانەت لە ناو مالیش‌دا ئافرەت بە کۆیلەو ئادەمیزادی دەرەجە دوو ئەزانن‌و ئەوەی لەبەر دەست پیاو نەمێنێتەوە ئافرەت نایخوا ، ئەگەر دایکیش بێت ؟!! جگە لەمەش هەندێ لە لاوە دواکەوتووەکانیشمان وا ئەزانن ئەگەر ئافرەت سەربەست بوو جلەو لە دەست پیاو ئەسێنێت‌و .. لەهەمان کاتیش بەندو باوی بێ توانایی‌و بێ بەهرەییشی ئەدەنەپاڵ ؟!! بەڵام بێ‌گومان نەسەربەست بوونی ئافرەت پیاو ژێر دەست ئەخاو ، نە ئافرەتیش ئەو گیان لەبەرە کەم توانایەیە کە باسی ئەکەن ، بەڵکو بە تەواوەتی بە پێچەوانەی ئەم بیرو رایانەوە ، ئافرەت سەربەستی پیاویش لە زۆر کۆت‌و پەیوەندی کۆمەڵایەتی کۆن‌و باری نزمی ئابووری‌و سەدان کەم‌و کووڕی‌تر رزگار ئەکات‌و زووتر ئادەمیزاد بەرەو گەیشتن بە ئامانجە گەورەکانی ئەبا .

بەستنەوەی ئافرەت لە ناو چوار دیواری ماڵدا هۆی سەرەکی‌ی دواکەوتن‌و بێ‌توانایيەتی لە کۆمەڵگا دوا کەوتووەکان‌دا ، ئەگینا کەی ئافرەتی سەربەست لە خزمەت کردنی وڵات‌و فیدا کاری‌و بەرهەم هێناندا لە پیاو کەمتر بووە ئەگەر ڕێگای جووڵانەوەی پێ درابێت‌و چووبێتە ناو کۆمەڵەوە ، چونکە سەرکەوتنی ئادەمیزاد تەنها بەند نەبووە بەهێزی بازووی پیاوەوەو ، زوربەی دڕندەکان لەپیاو بەهێزترن ، بەڵکومەسەلەکە سەرکەوتنی عەقڵی ئادەمیزادە بە سەر هێزدا کە ئادەمیزادیش لە ژن‌و پیاو پێك‌هاتووە ، هەر ئەم مەسەلەی بێ‌هێزی‌یەیە کە وای لە پیاوانی کۆمەڵە دوا کەوتووەکان کردووە ئافرەت ژێر دەست بکات‌و لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی مێژوودا بۆ بەرژەوەندی‌و خۆشی‌ی خۆی بەکاری بهێنێت وەکو بەکار هێنانی ئادەمیزاد لە لایەن ئادەمیزادەوە بە گشتی ، کە جیهانی ئەمڕۆ بەرەو لەناو بردنی ئەم خوێن مژی‌یە هەنگاو ئەنێت‌و وا خەریکە یەکسانی‌و سەربەستی‌ی کەسایەتی‌و کۆمەڵایەتی‌ی سیاسی بەدی دێت کە بێ‌گومان ئێمەی کوردیش هەروا دەستە وەستان بەرامبەر بەم پێشکەوتنە راناوەستین‌و هەر ئەبێ دەوری چاکی خۆمان‌ببینین .

---



پێکهاتنی نەوت‌دا ، **باشترین بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە نەوت لە لەشی گیاندار پەیدابووە . جگە لەمە زانای بەناوبانگی ئەڵمانی (ئینگلەر) تاقی‌کردنەوەیەکی کردووە بۆ دەرخستنی چۆنێتی پەیدابوونی نەوت لە گیاندار : ئەم زانایە ماسی‌یەکی ساردینی هێناوەو لە شووشەیەکی داخراودا دایناوە ، دوای ئەوەی کە شووشەکەی لە هەوا بەتاڵ کردۆتەوە ، وردە وردە شووشەکەی گەرم کردووە هەتا ڕادەیەك کە دیویتی شلەیەکی ڕەش لە شێوەی نەوت‌دا پەیدا بووە وە ئەم شلەیە بەکەڵکی سووتاندن هاتووەو لەم شلەیە نەوتی سپی‌ی دەرهێناوە.** دیسانەوە ناتوانین بەتەواوەتی بڵێین کە ئەم بیروڕایە زۆر ڕاستە بۆ لێکدانەوەی چۆنێتی پەیدابوونی نەوت لەسەر هەموو ناوچەیەکی زەمین‌دا ، لەبەرئەوە باشترین شت ئەوەیە کە بڵێین « بۆ لێك‌دانەوەی چۆنێتی‌ی پەیدابوونی هەر جۆرە نەوتێك ، بیروڕایەکی تایبەتی‌ی هەیە » . هەرچەندە راستترین بیروڕا ئەوەیە کە ڕەگەزی نەوت ئەگەڕێنێتەوە سەر گیاندارو ڕووەك ، چونکە لەم دوایی‌یەدا زاناکان ماددەی (پۆرفیرین)یان لە نەوت‌دا دۆزیوەتەوە ، ئەم ماددەیەش تەنها هەر لە لەشی گیاندارو ڕووەك‌دا دروست ئەبێت .

**نەوت لەکوێ پەیدا [illegible]ێت :**

نەوت لە جۆرە بەردێکی کون کون‌دا پەیدا ئەبێت‌و کونەکانی داگیر ئەکات ، بە زۆری لەو جۆرە بەردانەدا کە پێیان ئەوترێت بەردی نیشتوو واتا (رسووبی) وەکو بەردی لم‌و چەوو بەردی قسڵ (کلس) ، واتا ئەو بەردانەی کە بە شێوەیەکی ئەوتۆ کون کونن گازو شلەیان پیادا تێپەڕ ئەبێت ، ئەو بەردانەش لە (٥٠٠) ملیۆن ساڵەوە هەتا ملیۆنێك ساڵ لەمەوبەر پەیدابوون . وەکو زانراوە کە نەوت بەزۆری لە قووڵایی (١٠) هەزار پێ زیاتر ناڕوات بەولاوە هەرچەندە جاری وا هەبووە کە قووڵایی بیری نەوت گەیشتوەتە (١٨) هەزار پێ . بێ‌گومان ئەو گەرمی‌و قورسایی‌یەی کار ئەکەنە سەر نەوت بەپێی قووڵی ئەو بیرە ئەگۆڕێن .

# میهرەبان خاتووی بەروارى

عەبدولرەحمانی مزوری

بادینان لانـەی سـەدان شاعیرو گۆشـکەری دەیـان ئەدیبو زاناو هونەرمەندی مەزنو بەتوانای کورد بووە، کـە بلیمەتانە لـە میـانی زانستو ئەدەبو هونەرداو شۆڕەسوارانە هێزو تینـی خۆیان خستۆتە گەڕ ، هەر یەکەیان بولبولێـك بوون و ئاوازێکی بەجۆشی گـەرمو گوڕیان تێکەڵ بە سیمفۆنی ژیانی ئەدەب کردووە ، هەر یەکەیـــان شــاکارێکی سەرکەوتوانەی دلفڕێنیان لە پاڵ شـاکارە ڕازاوەکانی ترا ڕیـز کـردووەو هـەر یەکەیان مشتـێ گەوهەری درەوشاوەی گرانبەهای بــە دەگمـەن هەڵکەوتـوویان هاویشتۆتە سـەر خەرمانی زمانو ئەدەبی نەتەوەکەیان.

هەر یەکەش لەمانە ، بێ درێغی کردن ، زۆر گیان لە خۆ بووردوانە توانای خۆیان بەخت کـردووەو بوونـەتە مۆمێك ڕوناکی‌یـان پەخش کردووە .

ئەم زاناو بوێژو هۆنەرانە وەك ئەسـتێرەی گـەش‌و پرشـنگدار ، ئاسـمانی بادینانیان ڕۆشن کردۆتەوەو چوونەتـە پـاڵ ئەسـتێرە گەشـەکانی‌تری ئاسـمانی کوردەواری ، بگرە بوونەتە هاوسێ‌و هاودەمی ئەستێرە درەوشەدارەکانی تـــری ئاسمانی جیهان‌و لە ئاستی خۆیان شەوگاری تاریـك‌و نووتەکیان شەق کردووە و گەردو تەپ‌و تۆزی نەزانین‌و بێ‌هونەری‌یان لـە ڕووی خاك‌و میللەتی سست‌و دوا کەوتویان تەکاندووە ، ئـەم مرۆڤە هەڵکەوتوانەش وەك (ابن حاجب)ی کەشانی کە ـ یاقوت الحموی ـ لـە ( معجم البلـدان )دا ، بـە زانایەکی بڵندی سـەردەمی خۆی دادەنێ ، وە زانـای گـەورە ( شـێخ محمـدی خـوڕکی ) دانـەری کتێبی ـ رسالە فی الحساب ـ وە کتێبی ـ الاسطرلاب ـ وە ( شێخ ئـادی هـەکاری ) شاعـیرو فەیلەسـووف‌و نـوێ کـەرەوەی ئاینـی یەزیدی ، وە ( مەلا یەحیای مزوری ) زانـاو ڕاوێژکەرو پیاو ماقوولی میر محمـدی ڕەواندزی ، وە ( نورالدین بریفـکی ) شـاعیرو قطـبی زەمانی خۆی ، وە شـێخ طەهـای مـائی‌و منصـور گرگاشی‌و حەمـکی تۆڤی‌و بەکر بەگی‌ئەرزی‌و ئەحمەدی نالبەندو شێخ الاسلام ـ ابو سـعودی ـ ئامێـدی‌و سەدەهای‌تری وەك ئەمانە . وەنـەبێ ئافرەتیش خـۆی دوورە پـەرێز گرتبـێ‌و



نەهاتبێتە ریزی ئـەوان ، بەڵکە دەورێکی باڵای بووەو لە ئاقاری خۆیەوە بەردێکی خستۆتە سـەر بـینای شارستانیـەتی مـرۆڤو چەپکە گوڵێکی بۆن خۆشو مێخەکو سملی پژانـدووە بـەو خەرمانـەداو بـۆنو بەرامەیەکی هێجگار خۆشو سـەر کاسـکەری پـ[illegible] بەخشیوە .

ئافرەتیش شان بە شانی پیـاو خزمەتی هونـەرو ئەدەبو رۆشنبیری کوردی کردووە ، ئەوەتا مریەمخ[ان] میـان خاتـوون ، لیـلی بەدرخان ، فاطمە هەکاری ، نائلەخانو ، ئەم شاعیـرەی لێی ئەدوێـین ، میهرەبان خاتوونی بەرواریو دەیـانی تری وەك ئەوان کە هـەر یەکەیان شا گوڵێـك .. !! شەوچرایەکی رۆشنبوون .

(میهرەبان خاتوون) کچی مەلا (حوسنی) بەرواری‌یە ، هەندێ سەرچاوەی مێژویی وای بـۆ چوون کـە باوکی ناوی مەلا (حەسەن) وەیـا مـەلا ( حوسـەین )ی بەرواری‌یـە ، بـەڵام ڕاستی‌یەکەی ( حوسـنی ) بەرواری‌یە .

میهرەبان خاتـوون لـە سـاڵی ١٨٥٨ی زایینـی هاتۆتە دنیاوەو ، لە ساڵی ١٩٠٥دا کـۆچی دوایـی کـردووە . تا ئێستا بـە تەواوەتی ڕوون نەبۆتەوە کە ئـەم شاعیرە خەڵکی چ گوندێکی بەرواری‌یـە ، هەنـدێ لـە ئیختیـارو بەساڵاچووەکانی بادینان بـە خەڵکی ــ گارە ــی دادەنێن، هەندێکی‌تر دەڵێن خەڵـکی گوندی ــ تویلەر ــ بووە ، بەشێکی‌تر بە خەڵکی گوندی ــ مائی ــ دەزانن .

هەروەك دەمـاودەم لـە پیرەکانەوە بۆمان گەڕاوەتەوە میهرەبان خاتوون ئافرەتێکی شۆخو شـەنگو هێجگار کەڵەگەتو باڵا بەرز بووە ، ناسكو نازدار ، شـارەزاو زیرەك ، خوێنەوارو ژیـرو کارامە بووە .. جگە لەوەی لە ماڵداریدا بێ‌وێنەو لـە کارو فەرمانی پیشەسازیی خۆماڵی کوردەواری ئـەو سەردەمـەدا ، وەك تـەون چنینو دەسماڵ دروسـت کردن ، وەسـتاو دەسـت ڕەنگین بووە ، بە چەشنێك ئەو بەرهەمانەی دەستی ئەو نەخشاندوونی گەلێك بـە نرخو بە نامێ بوون ، لەبەر ئەمانە گەلێ سەردارو مـیر سەوداسەرو گیرۆدەی داوی خۆشەویستی ئـەو بوونو ویستوویانە بیخوازنو بـە ئاواتەوە بـوون میهـرەبان خاتوون دڵیان بداتێو ببێتە هاوسەریان ، بەڵام ئەو دڵی داوە بە ئامۆزایەکی خۆی .

یەکێـك لـە مـیرەکانی ئامێدی کـە مێژوو نـاوی نابات خوازبێنی لە بـاوکی کردووە ، باوکی خەریـك بووە گفتی پێ بداو بیداتێ ، کە میهرەبان بەمەی زانیوە، شیعرێکی پـڕ سـۆزی دڵ تەزێنەری بۆ میر ناردووە ، لەوشیعرەدا باسی دڵداری‌و ئەڤینی خۆی دەکات لەگەڵ ئامـۆزاکەی ، مـیریش زۆر جوامێرانە وازئەهێنێ تا دوو دڵو دوو گیان بەیەك شادو ئارام بکات .

ئەمـەش ئـەو تەنیـا شیعرەیە .. ئەو تەنیا گوڵە گەشـاوەیەی یـادگاری میهرەبان خاتوونـە کە لـە لاپەڕەکانی مێژوودا ماوە ، شیعرەکانی‌تر وەك گوڵ بـە دەم بای زریانو خـەزانەوە هەڵوەریوون .. داخـەکەم سیس بوونو ژاکاون .

**ئـەز چ بێـژم چ بەیانـکەم**
**کی بـە حـاڵی مـن دزان ؟!**
**مەخفیـانکا ، ئاشـکەراکەم**
**ئـاه ژقـی دەردێ گـران**
**ئاه ژ دەست عەشقو ئەڤینا**
**گەفتمـە تـازی و شـینا**
**کی دێ سـاخکەت ڤان برینا ؟!**
**چـو ژ دل سەد نـاخ و ژان**
**دەردەکـێ زورێ گرانـــە**
**عەقلو هـۆش مـن چ نەمانـە**
**مام پەپیـك و بـێ خودانــە**
**کـێ دی‌یە ئەڤ چ زەمـان ؟!**
**من نـەما سـەبر و قـەرارە**
**دل ژ مـن بـو پـارە پـارە**
**دۆزەخـە پـڕ نـار و مـارە**
**چـون ژ من هەسـت و خوان**
**دو دلا یـەك دو حەبـاندن**
**زەحمەتـە بێنـە ڕەڤانـدن**
**ئایەتـا عشـقێ بخانـدن**
**نائێنـە شـەرحو بەیـان**
**عەشـق نزانیتـن گـەداهی**
**عشـق نزانیـت پادیشاهی**
**شـوعلەکە ژ ڤـورا ئیلاهی**
**هـەر وەکـو روحو ڕەوان !!**

( بڕوانە : سـجادی : علاءالـدین ــ مێـژووی ئەدەبی کوردی ــ چاپخانەی معارف ــ بەغدا ١٩٧١ ــ چاپی دووەم ــ ل٩٥٤ .

هەروەها بڕوانە ( د. خەزنەدار ــ مارف : اغانی کردستان ــ مطبعە أسعد ــ بەغدا ١٩٥٦ ل.٣٠ــ٣١ ) .

( بڕوانە : گۆڤاری چیا ــ ژمارە ــ ٢ ساڵی یەکەم چاپخانەی دهۆك ١٩٧١ ز ل : ٣٥ــ٣٦ .

بڕوانە : جەباری ــ عبدالجبار محمد : ئافرەتـە ناودارەکانی کورد ــ چاپخانەی الجمهوریـە ــ کرکوك ١٩٦٩ز ــ ل.٥٠ ) .



نظيف هەورامی

# گــوڵي هــاوینــه

| زنجیره | ناوی گوڵ | کاتی چاندنی | هۆی زۆرکردنی | کاتی گواستنەوەی شەتڵ | کاتی گوڵ کردن | بۆ چەپك باشە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | گوڵە خەندان | ١٥ی شوبات تا مارت | تــۆو | مارت_نیسان | تەموز ــ ئاب | ناشێ |
| ٢ | نازناز | = = = = | = | = = | = = | ناشێ |
| ٣ | پرچی کچان | = = = = | = | = = | = = | دەشێ |
| ٤ | سلیڤیا_مەرجان | = = = = | = | = = | = = | ناشێ |
| ٥ | دەمەشێر | = = = = | = | = = | = = | دەشێ |
| ٦ | شەستپەڕ | = = = = | = | = = | = = | دەشێ |
| ٧ | مینا | = = = = | = | = = | = = | ناشێ |
| ٨ | مینا ئێرانی | = = = = | = | = = | = = | دەشێ |
| ٩ | لاولاو | = = = = | = | = = | = = | ناشێ |
| ١٠ | گوڵە خەنە | = = = = | = | = = | = = | ناشێ |
| ١١ | قەیفە | = = = = | = | = = | = = | دەشێ |
| ١٢ | ئەستەمبوولی | = = = = | = | = = | = = | دەشێ |
| ١٣ | کۆلیۆس | = = = = | تۆو ــ قەڵەم | = = | گەڵاکانی جوانە | گوڵەکەی |
| ١٤ | دالیا | = = = = | سەلك | ناگوێزرێتەوە | تەمووز ــ ئاب | دەشێ |
| ١٥ | . کشمیر | = = = = | تــۆو | مارت ــ مایس | = = | دەشێ |



## گـوڵي زســتانه

| زنجیره | ناوی گوڵ | کاتی چاندنی | هۆی زۆرکردنی | کاتی گواستنەوەی شەتڵ | کاتی گوڵ کردن | بۆ چەپك باشە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | گولاله‌ـشه‌قایق | ئه‌یلول ـ ت١ | سه‌لك ـ کورمه | ناگوێزرێته‌وه | شوبات ـ مارت | ده‌شێ |
| ٢ | نێرگس | = = | = × | = | = = | = |
| ٣ | هه‌لاله‌بره‌م | = = | = | = | = = | = |
| ٤ | سونبول | = = | = | = | = = | ناشێ |
| ٥ | شه‌وبۆ | = = | تـۆو | ده‌گوێزرێته‌وه | = = | ده‌شێ |
| ٦ | ئه‌رجایی | = = | تـۆو | = | = = | = |
| ٧ | هه‌میشه به‌هار | = = | = | = | = = | = |
| ٨ | به‌نه‌وشه | = = | = | = | = = | = |
| ٩ | گوله ره‌قه‌م | = = | = | = | = = | = |
| ١٠ | گوله دوگمه | = = | = | = | = = | = |
| ١١ | ده‌مه شێر | = = | = | = | = = | = |
| ١٢ | حسنی یوسف | = = | = | = | = = | = |
| ١٣ | مێخه‌ك | = = | = | = | = = | = |
| ١٤ | پاتۆنیا | = = | = | = | = = | = |
| ١٥ | عه‌تر | = = | = | = | = = | = |

# دیسانەوە گۆشەیەک لە ئەدەب و فۆلکلۆری ژن

**ئازاد بابان**

وەختی خۆی لە ژمارە (٢٢)ی گۆڤاری (بەیان)ی ئازیزدا نووسینێکم خوێندەوە بەناوی «گۆشەیەك لە ئەدەبو فۆلکلۆری ژن» کە نووسەرەکەی (سەعید) بوو جا هەرچەند ماوەیەکی زۆریشی بەسەردا ڕۆیشتووە ، بەلاَم گرنگیی بابەتەکە ئەو نرخەی ئەداتێ کە ئەو نووسینەشی بە هاوارەوە بچێ . نووسەر دوای ئەوەی زۆر بەشارەزایی دەگاتە سەر شوێنەواری فۆلکلۆری بابەتی ژن کە ژنانی مەشکە ژەن بە مەشکەیدا هەڵدەڵێن، ئیشارەت بەوە دەکاو دەڵێ «ڕەنگە لەو جۆرە هۆنراوانە لە ناوچە جۆر بەجۆرەکانی کوردستاندا بە زۆر جۆر گوترابن ، بەلاَم من تەنیا ئاگام لە هێندێکی ئەو هۆنراوە فۆلکلۆریانە هەیە» .. بۆیە منیش (ڕەنگە)کەی کاك سەعید دەگۆڕم بە دڵنیاییو ، شکی لێ دەردەکەم کە ئەوەی نووسیویەتی ڕاستە چونکە شایەرێکی زیرەكو گۆرانیبێژێکی لێزان ، بەیتی مەشکێ بە جۆرێ دەڵێ جیاوازییەکی لەگەڵ هی نووسەر هەیە . ئەو شایەرە ناوی ( ڕەسوولی نادری )یە کە لە بەیتێکی مەشکێدا ناوی خۆی تێداوێو دەگێڕێتەوە کە چووەتە چادرەکانی بەشی (مەنگوڕان)ی ئەودیو ، لە چادرێك لە چادرەکانی پشت ماڵی (کیسەلاَن) شەوێ بە میوانی ماوەتەوە ، دەڵێ لەو ماڵەیدا دوو بووك هەبوون یەکێکی ناوی (لالیخان) بوو ئەوی دی ناوی (پەریخان) بوو .. ئیدی ئەوێ شەوێ هەر «حەیرانە و گەلۆ»یان بۆ دەڵێو (نەقڵ)یان بۆ دەگێڕێتەوە ... پاشان دەنوون ، بەریبەیانی کە بەخەبەر دێ گوێی لێدەبێ کە لالێخان ڕوو لە پەریخانێ دەکاو دەڵێ با مەشکەی بژێنینو بە نۆر(١) بەندانی پێ هەڵبلێین . جا بەندی هەوەڵی پەریخان دەیڵێ :

**خەسووم عەمری نەمێنێ**
**لە هەیوانێم دەنوێنێ**
**ئاوی مەشکێم پێ دێنێ**
**دە ڕەبی ملانی دە قوڕێ نێ**
**هەی ماڵە بابی من بی**
**هەی عەمرو چاوی من بی**
**مەشکەم مەشکەی مانگایە**
**دەیژێنم لە بێلاَیە**
**ئەوڕۆ دەنگی چاك نایە**
**هەی ماڵە بابی من بی**



**هەی عەمرو چاوی من بی**

لالێخان تێڕا هەڵدەد[illegible]

**بار دەکەین بۆ پیر[illegible]ری**
**خودایە مەڕمان لێ [illegible]ڕێ**
**کابان زەمبێ هەڵناگرێ**
**میوانە (( ڕەسووی نادری ))**
**هەی ماڵە بابی من بی**
**هەی عەمرو چاوی من بی**
**بار دەکەین بۆ جانداران**
**ڕۆنی دەگرین بە باران**
**لە بۆ پایزە و هەواران**
**هەی ماڵە بابی من بی**
**هەی عەمرو چاوی من بی**

پەریخان :

**مەشکەم دەژێ بەیانە**
**ڕەسووی نادری میوانە**
**قەدری لەسەر چاوانە**
**خەڵکی نێو گەورکانە**
**هەی ماڵە بابی من بی**
**هەی عەمرو چاوی من بی**
**مەشکەم مەشکەی مانگە قوڵە**
**دەنگی دەڕوا وەك زەنگوڵە**
**ئەو مێردەم زۆر نابەدڵە**
**پێی قایل نیم خەرسە دڵە**
**هەی ماڵە بابی من بی**
**هەی عەمرو چاوی من بی**
**مەشکەم مەشکەی گامێشێ**
**چەندم شانو قۆڵ دێشێ**
**چەندم کردوە مەشکەژێنی**
**عەزاب نەبێ پێم نامێنێ**
**هەی ماڵە بابی من بی**
**هەی عەمرو چاوی من بی**

(١) نۆر ــ نۆرە ــ نۆبە .



# تیوری زانین لە فەلسەفەی ئەفلاطوندا

حەمید عەزیز

**سەرەتا :**

تیوری زانین یاخود [illegible]مۆلۆگیا (نظرية المعرفة) بەگرنگترین لقەکانی فەلسەفەی نوێو هاوچەرخ ئەژمێردرێ .. ئەگەر بمانەوێ لەو لقە بکۆلینەوە ئەوا ئەبێ لە هەموو فەلسەفەی نوێ بکۆلینەوە کە لەسەدەی پانزەهەمەوە دەست پێ‌ئەکات ... جابۆیە بێرتراند رەسل بەبێ سڵ‌کردنەوە ئەڵێ : لۆجیكو تیوری زانین بە هەردووکیان فەلسەفەی نوێ پێك‌ئەهێنن . پێش ئەوەی بچینە ناو باسەکەوە وای بەباش ئەزانم سەرنجێك لەو لقەو بابەتو مێژووی سەرهەڵدانی بدەین بۆئەوەی بتوانین گرێ‌کوێرەکانی بکەینەوەو تیشك بخەینە سەر لایەنە تاریكو نادیارەکانی .

ئەگەر سەرنجێك لەو مۆزەخانەیە بدەین کە مێژووی فەلسەفەی کلاسیکی پێ‌ئەوترێ بۆمان دەرئەکەوێ ئەم تیورە وەکو بابەتێکی سەربەخۆ لەسەدەی حەڤدەهەمەوە لەلایەن فەیلەسووفی بەناوبانگ ( جۆن لۆك ١٦٣ـ١٧٠٤ز )ەوە سەری هەڵداوە . لۆك کتێبێکی دانا بەناوی «لێکۆلینەوەیەك دەربارەی تێگەیشتنی ئادەمیزاد» Essay Concerning Human Understanding تیایدا ئەڵێ : مێشك ، عەقڵی ئادەمیزاد ، وەکو لاپەڕەیەکی سپی وایە Tabuku Raza ژیانی ڕۆژانەو تاقی‌کردنەوە شتی لەسەر ئەنووسن ... **[ ئەو شتانەی ئێستاکە لە مێشكو عەقڵماندا هەیە لە بنچینەو سەرەتادا بە ـ هەست ـدا تێ‌پەڕیون ]** (١) . بەڵام لە فەلسەفەی یۆنانو سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەم ڕێکوپێکی‌یە دەربارەی ئەم لقەی فەلسەفە بەرچاو



ناکەوێ ... هەر فەیلەسوفە بەپێی بۆچوونو بیری خۆی ئەم بابەتەی کردوە بە لقێکی ڕێبازەکەیو کەم تا زۆر بایەخی پێ‌داوە ... ئەرستۆی دەریا عیلم تیوری زانینی کردوە بە بەشێك لە میتافیزیقاو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەیەگجاری ئەم بابەتە پەکی کەوت چونکە وەحی بوو بە سەرچاوەیەکی گومان لێ‌نەکراوی هەموو ڕاستیو بڕوایەك ! .

**بابەتی تیورەکە :**

لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەوە بابەتەکانی تیوری زانین دەرئەکەونو ڕێختی گشتی



فەیلەسووفەکەش دیاری ئەکرێ کە ئایا سەر بە کام ڕێبازو قوتابخانەیە ، پرسیارەکانیش ئەمانەن :

- ئەتوانین چی بزانین ؟!
- سروشتو بابەتی ئەو شتە چیە کە ئەتوانین بیزانین بە بێ ئەوەی گوێ بدەینە جۆرو ڕەگەزەکەی .
- زانیمان لەکوێوە دەستگیر ئەبێ .
- ئایا زانینی ئادەمیزاد سنوورێکی هەیە بیگاتێو نەتوانێ لێی تێبپەڕێ(٢) یان نا ؟!
- تا چ رادەیەك ئەتوانین دلنیا بین لەوەی ئەو شتانەی ئەیانزانین راستن‌و هەلەو چەوت نین ؟!
- کام ، لەمانە ، سەرچاوەی زانینە : عەقل ، حەواس (هەست) ، تاقی‌کردنەوە ، سەرنجدان ؟!
- پەیوەندی عەقل وەکو ـ ذاتێك ـ چیە بەو شتانەوە کە ئەیانزانین‌و بە ـ موضوع ـ دائەنرێن ؟!
- ئەو تیورەی لە مەسەلەی زانیندا پەیڕەوی ئەکەین تا چ رادەیەك کار ئەکاتە سەر کردارو ژیانی ڕۆژانەمان .
- دەوری پراکتیك (الممارسة العملية) وەکو پێودانگێك چیە لە هەلسەنگاندنی ئەو شتانەی ئەیانزانین ؟!
- خۆ ئەگەر ئەم خالانەی سەرەوە بکەن بە ڕستەو پرسیارێك ، ئەوا ئەلێین «چۆن ئەو شتانەمان زانیوە کە ئێستا ئەیانزانین ؟!»

**ڕێبازەکە :**

ئەفلاتوون ، هەروەکو لە بەرهەمەکانیەوە دەرئەکەوێ ، کتێبو نووسینی تایبەتی بۆ ئەم تیورە تەرخان نەکردووە بەلکو ئەم لقە بە پەرش‌و بلاوی لە چەند بەرهەمێکی‌دا دەرئەکەوێ کە ئەمانەن‌و تەرجەمەی عەرەبی کراون : کتێبی الجمهورية ، فیدون ، تیاتیتوس ، تیوری فۆرم ، نەفس ، میتولوجیای ئەشکەوت ... کەوابوو پەنا بۆ دوو جۆرە سەرچاوە ئەبەین ، بەرهەمەکانی خۆی‌و ئەو بەرهەمانەی کە مێژووناسانی فەلسەفە لەسەر ئەو دانایەی یۆنانیان نووسیوە .

**لە جیهانی فەلسەفەدا لەفلاتوون دوو ڕێبازی لە بەردەستدا بوو ، ڕێبازی هیراقلیتس کە بریتیە لە گۆڕانی بەردەوام‌و هەمیشەیی‌و [ هەموو شتێك ئەگۆڕێ‌و هیچ شتێك هیچ ساتێك لەسەر یەك شێوە نامێنێ ] .**

دووەم ڕێبازیش فەلسەفەی پارمەندیس بوو کە هەموو جۆرە گۆڕانێك ڕەت‌ئەکاتەوەو بڕوی بە وەستان‌و نەگۆڕان‌و بوونی رووت هەیە (بوون هەیەو ناگونجێ نەبێ ... ئەوەی هەیە ، هەیەو نەبوونیش ، نیەو نەبوونە) ... بەم پێیە لەلای هێراقلیتس هەست (حواس)و لەلای پارمەندیس عەقل سەرچاوەی هەموو زانینێکە(٣) .... ئەفلاتوون هەردوو ڕایەکەی لێك‌داو هەریەکەی لە مەیانێك‌دا بەکارهێنا ، لە مەیانی جیهانی (محسوس)دا ڕای هیراکلیتس‌و لە مەیانی جیهانی (معقول)دا ڕای دووەمیانی پەسند کرد . بۆ ؟ چونکە وەکو ئاشکرایە ئەفلاتوون بوون ئەکات بەدوو بەشەوە کە هەردوو جیهانەکەی سەرەوەیەو یەکەمیان ئەگۆڕێ‌و بەهۆی هەستەوە (کە ئەویش ئەگۆڕێ) دەرکی پێ ئەبردرێ‌و جیهانی دووەمیشیان جیهانی بیری ڕووت‌و فۆرمە لە گۆڕان بەدوورەو بەهۆی عەقلی ڕووتەوە ئەزانرێ . جیهانی یەکەمیش سێبەرو لاسایی کردنەوەی جیهانی دووەمە جا بۆ ساغ کردنەوەی ئەم ڕێبازەو

گەیشتنە ئەم ئەنجامە ڕای هیراقلیتیسی ڕەت کردەوەو پەنای بردە بەر عەقڵ ...

## زگماکی زانین :

بەڵای ئەفلاتوونەوە ئەو شتانەی ئێستا ئەیانزانین هەر لە زگماکەوە زانیومانن‌و ئێستاش بەهۆی شتی‌ترەوە کە ئەیبیستین یان بەرچاومان ئەکەوێ بیرمان ئەکەوێتەوەو دێتەوە [یا]دمان . **جا بۆیە زانین [ بەبیرهاتنەوەی ژیانی پێ[شوو]یە ]** (٤) ... خۆ ئەگەر منداڵێك یان کەسێك کە ئەندازیاری‌ی نەخوێندبێ پرسیاری لێ‌بکەین‌و وردە وردە یارمەتی بدەین ئەگاتە ئەنجام‌و بەڕاستی‌ی وەڵامی پرسیارەکەمان ئەداتەوە ، کە لەسەر ئەندازە بوو ... ئەمەش لەوەوە هاتووە کە نەفس پێش ئەوەی بچێتە بەر لەشی ئادەمیزادەوە لە جیهانی فۆرم (المثل)دا بووەو بە سەیرکردنی جیهانی مەعقول بەختیار بووە ، شتی زانیوە ، توانای بینینی لە ئەندازە بەدەر بڕی کردوە بەڵام هەڵەو گوناهی کردوەو فڕێدراوەتەوە ناو جیهانی ئێمەوەو کەوتۆتە ناو لاشەوەو لاشەی مرۆڤی هێناوەتە جوڵە هەروەك بەردێك فڕێدەیتە ناو گۆمێك ئاوەوە ... لاشەش بەندیخانەی نەفسەو ئەو فڕێدان‌و هاتنە خوارەوەشی کە سزادانی بووە هەموو شتێکی لە بیر بردۆتەوەو ئێستاش کە چاومان بەشت ئەکەوێ شتە کۆنەکانمان بیرئەکەوێتەوە .

**کەواتە ئەم نەفسە چۆن لەم سزایە دەرباز ئەبێت ؟!** ئێمەی گیان‌لەبەری لە مادە دروست‌کراو چۆن فۆرم‌و جیهانی مەعقوولی نامادده ئەناسین ؟! لە وەڵامدا ئەفلاتوون ئەڵێ بە پەروەردەی تایبەتی‌و هەردوو دیالێکتیکی ڕوو لە بەرزو بەرەوخوار زانینی ئادەمیزاد بەرەو سەرو هەنگاو ئەنێ‌و ئەگاتە ئەو ڕادەیەی دەرك بە زانینی ئەم جیهانە بەرێت‌و نەفسیش بگەڕێتەوە دۆخی جارانی [ عەقڵ بەم ڕێبازە لە جیهانی هەست پی‌کراوەوە بەرەو جیهانی مەعقوڵ بەرز ئەبێتەوە تا ئەگاتە قۆناغێك ڕاستەوخۆ بە بینینی فۆرم‌و خێرو بوونی – مطلق – شاد ئەبێت ](٥) ... کەوابوو دوو ڕێگا لەم کێشەیەدا لە بەردەم عەقڵدا هەیە پیایاندا ئەڕوات :

- تەرکیبی کە تیایدا لە (جزء)ەوە بەرەو (کلی)و فۆرم ئەچێ .
- شی‌کردنەوە (تحلیلی)یە کە لە فۆرمەوە سەرەو ژێر ئەبێتەوە .

لەم دوو پرۆسێسەدا عەقڵ بە هیچ جۆرێك پەنا ناباتە بەر (هەست) [ چونکە ئەم ئامرازە درۆزنەو هیچ جێگای دڵنیایی نیە ](٦) . بۆ ڕوونکردنەوەی پتری ئەم مەسەلەیە ئەفلاتوون نموونەی ئەشکەوت ئەهێنێتەوەو ئەڵێ :-

وای‌دائەنێین تاقمە کەسێك لەسەرەتای لەدایك بوونیانەوە لە ئەشکەوتێكدا کۆت‌و پێوەند کراون‌و ناتوانن بە هیچ لایەکدا جوڵە بکەن یان ئاوڕ بدەنەوە لە دەرەوەی ئەشکەوتەکەو لە جێگایەکی بەرزدا ئاگر[ێ] کراوەتەوە ، لەنێوان ئاگرو ئەشکەوتەکەدا ڕێگای[ەك] هەیە خەڵکی پیادا هاموشۆ ئەکەن ، تیشکی ئاگر وا ئەکات سێبەری ئەو کەسانەو ئەو شتانەی پێیانە لە دیواری ئەشکەوتەکەی بدات‌و خەڵکی ناو ئەشکەوتەکە ببینن ، خەڵکی ناو ئەشکەوتەکەش وا ئەزانن ئەو سێبەرانە شتی ڕاستەقینەن چونکە لە سەرەتای ژیانیانەوە لەگەڵیانا ڕاهاتوون‌و شتی‌تریان نەدیوە(٧) ... خۆ ئەگەر یەکێك لەو گیراوانە بەرەڵلا بکەین‌و بیهێنینە دەرەوە ، چی بەسەر دێت ، چی‌ی ئەبینێ ؟! یەکسەر ئەحەپەسێ‌و تیشکی ئاگرەکە ئازاری چاوی ئەدات ، چونکە هەر لەگەڵ دیتنی سێبەری شتدا

ڕاهاتووە ... بەڵام وردە وردە ئەو کەسە لەگەڵ شتە تازە ڕاستەقینەکاندا ڕادێتو ئنجا ئەتوانێ نەك هەر تەماشای ئاگرەکە بکات بەڵکو ئەتوانێ سەرنجی خۆریش بـدات کە سەرچـاوەی هەمـوو ڕووناکی‌یەکە . **نـاو ئەشکەوتەکە جیهانی هەستپێکراوی درۆزنە ، بینینی سێبەرەکان زانینە بە هەست (حواس) ، ڕزگاربوونیش لەم جیهانـە تەنیا بەهـۆی دایلێکتیك‌و(٨) پـەروەردە ئەبێت ، شتە ڕاستەقینەکانیش فۆرم (مثل)ن خۆریش بەرزتـرین نمـوونەی (خـیر)و سـەرچاوەی بـوونو کاملی‌یە .**

دوای ئەم نموونەیە ئەتوانین هەنگاوێك بەرەوپێش بهاوێژینو بڵێین بەباوەڕی ئەفلاتوون زانینی ئادەمیزاد بە چوار قۆناغدا تێئەپەڕێ تا ئەگاتە قۆناغێك ڕاستی ڕووت ئەزانێو دەرکی پێ ئەکاتو پەردەی گومانکردن لائەبرێت .

**چوار قۆناغەکە :**

ئەو چوار قۆناغەش کە مێشكو بـیری ئادەمیزاد پیایاندا تێئەپەڕێ بەرەو جیهانی مەعقول ئەمانەن :

- هەست یان خەیاڵ .
- بڕوا یان باوەڕ .
- تێگەیشتن .
- عەقلی ڕووت یان زانینی فۆرم (المثل)(٩) .

بە بـاوەڕی ئەفلاتـوون هەست یـەکەم قۆناغی زانینە ، بەڵام دڵنیایی لێناکرێ چونکە ئەگۆڕێو هـەر شتێکیش بگۆڕێ درۆزنە [ کە نەخۆشی ، ئاو لە دەمتا تاڵەو کە ساغیش بێ تامەکەی تاڵ نـیە ] سەبارەت بە



بڕواش هەمان شت ئەیگرێتەوە چونکە بڕواو بـاوەڕ پەیوەندی‌یان بە شتی نەگۆڕاوەوە نیەو بەپێی بابەتەکە ئەگۆڕێنو خۆشی مادی‌یەو مادەش هیچ کاتێك لەسەر شێوەیەك نابێ جگە لەمەش ئەو شتەی لـەم قۆناغەدا ئەیزانی ناتوانی بەباشی هۆیەکانی بۆ خەڵکی‌تری ڕوون بکەیتەوە بۆئەوەی پێیان بسەلمێنی .... لـە قۆناغی سێیەمدا ئەفلاتوون سیستەمێکی تایبەتی خوێنـدنو پەروەردە کـردن پێشنیار ئەکات کە تیایـدا ژمێرەو ماتماتیك‌و ئەندازیاری‌و فەلەك‌و مۆسیقا ئەخوێندرێو ئەم بابـەتانەش نەفسی ئادەمیـزاد پلەیـەکی‌تر بـەرز ئەکەنەوە ... لە قۆناغی چوارەمدا نەفس لە چەپەڵی‌ی مادە دەربازی ئەبێتو ئەوکەسە کە [فەیلەسووفە] بـە زانـینو بینینی جیهـانی مەعقولو بـیری ڕووت شاد ئەبێت .

**ئەنجام :**

ئەفلاتوون وەکو فەیلەسوفێکی ئایدیالیست ( بگرە داهێنەری ڕێبازی ئایدیالیزم ) بە هەموو توانایەکیەوە (هەستو تاقیکردنەوە) وەکو ئامرازو ڕێگای زانین ڕەت ئەکاتەوەو بەتوندی ئەڵێ عەقڵ ، بەتەنیا عەقڵو بیر سەر[illegible]وەی بێگەردو گومان لێنەکراوی زانینن ... چونکە هەروەکو خۆی ئەڵێ هەست درۆزنەو لە دوورەوە شت بە بچووکیو لە نزیکەوە بە گەورەیی ئەب[illegible]یان کێشەی سەرابو بیابان کە بە چاو ئەی[illegible]و هەر دوای ئەکەوینو نایگەینێ .... ئەفلا[illegible]وون دوای کۆششێکی زۆر گەیشتە ئەو رادەیەی کە ماتماتیك (الریاضیات)و لقەکانی بەباشترین بوارو مەیدانی زانین دابنێ[10] کە هیچ گومانی لێ ناکرێ ... هیچ کەسێك ناتوانێ بڵێ ٢ + ٢ ناکاتە چوارو سێ گۆشەیی (مثلث) هەموو کاتێ (١٨٠) دەرەجەیە ... جا بۆیە بە خەتێکی دیار ئەفلاتوون لەسەر دەرگای ئەکادیمیەکەی نووسیبوو : **( هەرکەسێ لە ئەندازیاریو ماتماتیك زۆر باش نەزانێ نابێ بێت بۆ لامان ) .**

لە سەرێکیترەوە ئەگەر وردتر سەرنجی قسەو نموونەکانی ئەفلاتوون بدەینو لایەنە ئایدیالیستیەکەی فرێبدەین کە جیهانی (مثل)و بیرو ماهیەتە[11] ئەبینین هەنگاوێکی دلێرانەی بەرەوپێش هاویشتووە کەئەویش پەنا بردنە بۆ ماتماتیك (الریاضیات) وەکو بابەتو زانستێكو خۆ ئەگەر ئەو جیهانەی سەرەوە بگۆڕین بە پلەو قۆناغو ئاستێکی رووتی بیری زانستیانە ئەوا ئەوەندەیتر ئەفلاتوون لە تیورەکانی فەلسەفەی هاوچەرخو بیری هەندێ زانایانی فیزیا نزیك ئەبێتەوە ... چونکە ئەو زانایانە بەجۆرێك سەرنجی زانینی زانستیانە Scientific Knowledge ئەدەن کە ئایا تا چ ڕادەیەك ئەو موعادەلەو بیرو زانینە لە ماددەوە دوورەو تا چەند پەیوەندی بە واقیعەوە هەیەو جۆری ئەو پەیوەندیە چۆنە ؟!

---

**سەرچاوەکان :**


(١) یوسف کرم : تاریخ الفلسفة الحدیثة ، دار المعارف بمصر القاهرة ــ ١٩٦٢ ل١٤٦ .

(٢،٨) هنتر مید : الفلسفة انواعها ومشكلاتها ترجمة د. فؤاد زكريا دار النهضة المصرية القاهرة ــ ١٩٦٩ ، ل١٧٣ .

(٣) رسل ، برتراند : تاريخ الفلسفة الغربية ترجمة د. زكي نجيب محمود ك ١ لجنة التأليف والترجمة والنشر ، القاهرة ــ ١٩٦٧ ط ، ل ١٧٧ و ١٧٨ .

(٤) افلاطون : فيدون : ترجمة وتحقيق د. على سامي النشار وعباس الشربيني ، دار المعارف بمصر القاهرة ــ ١٩٧٤ ، ل ٣٨ و ٣٩ .

(٥) متى ، الدكتور كريم : الفلسفة اليونانية . مطبعة الارشاد بغداد ١٩٧١ ، ل ١٦١ .

(٦) افلاطون : تياتيتوس او العلم ، ترجمة د. اميره حلمى مطر ، الهيئة المصرية العامة للكتاب القاهرة ــ ١٩٧٣ ، ل ٦١ .

(٧) افلاطون : الجمهورية ترجمة ودراسة د. فؤاد زكريا ، الهيئة المصرية العامة للكتاب القاهرة ــ ١٩٧٤ ، ل ٤٣٢ ــ ٤٣٣ .

(٨) كرم ، يوسف : تأريخ الفلسفة اليونانية ، لجنة التأليف والترجمة والنشر القاهرة ــ ١٩٧٠ ، ط ٥ ، ل ٧٤ .

(٩) افلاطون : الجمهورية : ل ٤٥٩ .

(١٠) ريشنباخ ، هانز : نشأة الفلسفة العلمية ترجمة د. فؤاد زكريا ، دار الكاتب العربي للطباعة والنشر القاهرة ــ ١٩٦٨ ، ل ٣٨ .

(١١) خليل ، الدكتور ياسين : منطق المعرفة العلمية ج١ من نظرية العلم ، منشورات الجامعة الليبية ١٩٧١ ، ل١٨١ .

ئیسماعیل ڕۆژبەیانی

# کولیچەی جەژن

منالەکـەی لەباوەشـیا درێژ کردبـوو ، مەمکی سپی‌ی کچانەی خستبووە دەمی . ئەمیش بێ‌ئـەوەی چاوی لێ‌دابگرێت دەستی کرد بە تێك‌دانی چایەکەی ، بەڵام ئەو پـەردەی بێ‌دەنگی‌ی نێوانیـانی دڕی‌و هاتە قسە :

– ئەم جەژنەش نەکەی بە جەژنەکەی‌تر . بایی دە دوانزە پەنجایی چۆرەك‌و مۆرەکمان بۆ بکڕی‌و ئیلەڵلاو بڕایەوە .

– ئەی بەتەمای چیت ؟

– بەتەمای ئەوەم منیش وەکو ئەو خەڵکە کولیچە بکەم .

– کچێ کولیچەکردن سـەرەڕای هیلاکی‌یەکەی پارەیەکی زۆریشی تێ‌ئەچێت .

– گوایە ئێمە لە ماڵە حەماڵەکانیش کەمترین ؟

– بێ‌ئەقڵ حەماڵی‌ی ئەمڕۆ کوێخایی‌یە . ئەوی هیچ نەبێـت ئەمـڕۆ مووچە خـۆرە « ناومان هەیـەو ناوکمان نی‌یە » .

– ئەمانە نازانم ، سبەی نیوەڕۆ لەگەڵ خۆتـدا ئاردەکەی بهێنەوە . خۆێشم تروتفاقەکەی ئەکرم .

دووکانی ئاردفرۆشـەکە ئەوەنـدە قەڵەباڵغ بوو سەد سوێندت ئەخواردو ئەتـوت هێلکەی لێ دابەش ئەکەن . ئەمیش خۆی‌کرد بەناو حەشاماتەکەدا ، هەر کیسە ئارد بوو بە بان‌سەری خەڵـکەوە رائەکێشرا . ئەگەر لادێیی‌یەك بەوێدا تێپەڕ بوایە سەری لە چۆنیەتی‌ی یەکگرتنی ئەو هەموو ئاشەوانانە سووڕ ئەما . لەپـڕ کیسەیەك لە ڕاکێش ڕاکێش‌دا دڕاو بـۆ نەگبەتی ڕژا بەسـەریا . لەبەرخۆیەوە کردی بەبۆڵەبۆڵ‌و قسەکردن. هەزارو یەك نەحلەتیشی لە جەژن‌و تەدارەکی جـەژن کـرد . هەرچـۆنی بـوو ئاردەکـەی وەرگـرت‌و بـە خۆڕاپسکاندن هاتەدەرەوە ، ئـەوی ئەیبینی دەسـتی ئەکرد بە پێکەنین‌و توانج لێ‌گرتنی .

– تەکسی ... تەکسی ..

ئۆتۆمۆبیلەکە ڕاوەستا . ئەمیش بە پەلـە خۆی هاویشتە نـاوی . شۆفێرەکە ئاوڕێکی لێ‌دایـەوەو بزەیەك گرتی .

کیسەکەی داناو دەستی کرد بە جوێن‌دان :

– بە ژەهرتان بێت ... قوزەڵقورت بخۆن ...

– دەباڵلا دەی چی‌بووە ؟ ئەوە قاتی‌ترت هەیە لەبەری‌کە ، تاکو ئەمە ئەدەی بە شۆردن .

ئیتر ئەمەی پێ‌ئەوێ ؟

بارانەکەی وا بەنەرمی ئەباری زەوی‌یەکەی کردبووە هەویرەنچە . کۆڵانەکانی سەر جادەکە فڕیان لێ‌هاتبو . بەشێوەیەکی ئەوتۆ قوڕیان ئەجاکان جادەکەشیان پێوە لەوتاندبوو .

لەوەتی لەدایك بوون ئەمە ڕەوشتیانە .

هەر ئافرەت‌و منال بوو سینیە کولیچەی نابووە سـەرەوەو بـەرەو فڕنـەکە ئەڕۆیشـتن . ئـەمیش سینیەکانی خۆی خستە سەر عەرەبانەیەك‌و بردی . هەر سینیەکیش کەوچکێکی خستبووە سەر بۆئەوەی نەگۆڕێ . بەم‌لاو بەولای فڕنەکەدا سینی ڕیز کرابوو . ئـەمیش سـینیەکانی خـۆی لەلایـەکەوە ڕیزکـردو بەدیاریانەوە دانیشت تاکو نۆرەی بگاتێ .

دوو ئافرەتەکەی تەنیشتی بەدەنگێکی بەرز هەر یەکە باسی جـوانی‌و دەس‌ڕەنگینی‌ی کچـەکەی خۆی ئەکرد . لەناکاو بووە شاتەشاتیان ، نابەخوا دەستیان لەقژی یەکتر گیر بوو . بەدەم قژ ڕاکێشـانەوە کەوتنـە بۆقدانی یەکتر . هەرچەنی‌کرد دووریان بخاتەوە بەڵام بۆی‌نەکرا . سینیە نیشـان کراوەکانیان دوو گاسنەیەکی باش‌کرد .

بە کزی‌یەکەوە سـینیە بەتاڵەکانی هەڵگـرت‌و گەڕایەوە .

**– پیـاوەکە ئێوارە بـایی دە دوانزە پەنجـایی لە چۆرەکەکانی ئەوسامان بۆ بهێنەوە .**



گی دوو موپاسان

# تەنیا

## هەمیشە تەنیا

هێمن وەری گێڕاوە

**گی دوو مووپاسان**
**هێمن**
**لە فارسیەوە**
**وەری گێڕاوە**

پاش خواردنی ژەمێکی تێر و پیاوانە هەموو شاد و دلخۆش بوون ، یەکێك لەوان ، دۆستێکی کۆنم گوتی :

ــ پێت خۆشە کەمێك لە «شانزلیزە» بگەڕێین ؟ وەڕێ کەوتین ، بەبن ئەو دارانەدا کە هێشتا تاکو تووك گەڵایان پێوە مابوو ڕۆیشتین . هیچ دەنگێك نەدەهات جگە لەو زەنا زەنایەی کە هەمیشە لە پاریس دا هەیە و نابڕێتەوە . شنەیەکی فێنك رووومەتی ئێمەی دەنگاوت . کۆمەڵی ئەستێرەکان بە ئاسمانی ڕەشەوە پرشنگی زیوین یان داوێشت .

دۆستەکەم گوتی :

ــ نازانم بۆ شەوانە لێرەدا لە هەموو جێیان ئاسوودەتر هەناسەم دێ و دەچێ ؟ بیرم پان و بەرین تر دەبێوێ لە پڕ برووسکەیەك مێشکم ڕووناك دەکاتەوە کە بۆ تاوێك دەمەوێ لە هەموو رازەکانی جیهان بگەم .

پاشان ڕۆچنە داخندرێ ، هەموو شت دەبڕێتەوە . هەر وا دەڕۆیشتین ، جار جار دوو سێبەرمان دەدین کە لە سیلەی دیوارێکدا دەلەرزین ، یا بەلای تەختێکدا تێدەپەڕین کە دوو ئینسانی لەسەر بوون وا پێکەوە نووسابوون دەتگوت پەڵەیەکی ڕەشن .

ئاوالەکەم دەیگوت :

ــ بێچارانە ! « نام ئاروو ژێنن هەر ئەوەندە هەیە

هەست بە بەزەیی‌یەکی قووڵ دەکەم ! » لە نێو رازەکانی ئەم جیهانەدا من تەنیا لە یەکیان ورد بوومەوە .

« چارە ڕەشی هـەرە گەورەی ئێمە لـە ژیاندا ئەوەیە تا هەین تەنیاین . هەموو تێکۆشانمان بۆ ئەوەیە لە چەنگ ئەو تەنیایی‌یە رابکەین . ئەوانەی لەسەر ئەو تەختانە دانیشتوون وەك ئێمە و وەك هەموو کەسی‌تر دەیانەوێ تەنانـەت بۆ تاوێك بە تەنێ نەژیـن ، کەچی هەتا هەتایە تەنیان . هەموو کەس کەم تا کورتێك لەوە گەیشتوە » .

من ماوەیەکە رەنجی تەنیایی دەکێشم ، دڵنیاشم هیچ شتێك ناتوانێ دوایی بەو رەنـجە بێنێ ، گوێت لێ‌یە هیچ شتێك .

هەرچەندی تێ‌بکۆشـین ، هەر کارێـك بکەین ، قسەمان چەند نـەرم بێ و باوەشمان چەنـد گەرم ! هەمیشە هەر تەنیاین !

من ئەمشەو تۆم بۆیە لەگەڵ خۆم گێڕا تا بە تەنێ نەچمەوە ماڵ چونکە زۆر لە تەنیایی بێـزارم . بەڵام چ قازانجێکی بوو ؟ من قسانت بۆ دەکەم تۆش گوێم بۆ رادەدێری پێکەوەین ! کەچی تەنیاین تێ‌دەگەی دەڵێم چی ؟

لە کتێبی پـیرۆزدا هاتوە : « چەنـد بەختەوەرن ساویلکەکان ! »

ئەوان خۆ بە بەختەوەر دەزانن ئەوان ئەو تەنیایی‌یە شوومـەی ئێمە هەست ناکەن ، ئـەوان وەك ئێمە لە ژیاندا سەر لێ‌شێواو نین .

رەنگ بێ پێت وابێ کەمێك شێتم وا نیە ؟!

گوێت لێ‌بێ ! لـەو کاتەوە هەستم بـە تەنیایی کردوە ، پێم وایە هەموو رۆژێ زیاتر لە پێشوو بەرەو تاریکخانەیەك دەچم کـە دیوارەکانی نابینـم و نازانم بنەبانی لە کوێ‌یە ! بەو تاریکخانـەدا دەڕۆم بێ‌ئەوەی کەس ڕابەرم بێ ، کەس لە دەور و بەرم بێ و کەس وەك من ئەو کوێرە رێ‌یە باریك و تاریکە بپێوێ .

لەو تاریکخانەدا جگە لە دەستی خۆم هەست بە هیچ دەستی دیکە ناکەم . دەزانی دەڵێم چی ؟!

چەند کەسـێك لەو ژیانە بێ‌ئامانـە گەیشتوون « ئالفرد دوو موسە » دەڵێ :

ـ کـێ دێ ؟ کێ من بانـگ دەکا ؟ هیچکەس ، تەنیام تەنیا .... ئەی تەنیایی رەش و شووم !

بەڵام ئەوەی بـۆ من بڕوایـەکی تەواوە بـۆ ئەو گومانێك پتر نەبـوو ، ئەو شـاعیر بوو ، ئـەو تاپۆ و تارمایی دەخولقاندن ، ئـەو بەراستی قەت بـە تەنێ نەدەماوە ، کەچی من .... من تەنیای تەنیام .

« گوسـتاو فلوبیر » یەکێك لـە چارەڕەشترین مرۆڤی جیهان ـ چونکە یەکێك لە ڕۆشن‌بین‌ترین ئینسان بوو ـ . ئـەم رستـە کورتەی بـۆ دۆستێکی خـۆی نووسیوە : « ئێمـە لە چۆڵێـك‌دا دەژین کـەس کەس ناناسێ ! »

نا ، نا ، هەرچی بڵێین ، هەرچی بیر بکەنەوە ، هەرچی خۆ لە دار و بەرد دەن ، کەس کەس ناناسێ . ئایا زەوی دەزانێ لەو ئەستێرانەدا کە ئەوەندە دوورن هەر پرشنگیان دەگاتە ئێمە چ رادەبرێ ؟

بەڵێ مـرۆڤ زۆر ... ئەوەش کەمتر لە هەسـتی مرۆڤێکی دیکە ئاگادارە . ئێمە وەك ئەو ئەستێرانە لێك دوورین و زیاتریش تەنیا ماوینەوە . چونـکە ناتوانین بیرکردنەوەی یەکدی شی بکەینەوە و لـە رازی یەکتر بگەین . تـۆ هیچ شـتێك لەو مرۆڤـانەی خۆ لێـك هەڵدەسوون ، بەڵام ناتوانن یەکتر بناسن چارە رەشتر دەبینی ؟

ئێمە ئەوەندەمان یەکتر خـۆش دەوێ کە دەڵێی زنجیر کراوین . بە ئامێزی ئاواڵەوە لە تەنیشت یەکتری بێ ئـەوەی بتوانین بە یـەك بگەین . تاسـەی نیـزیك بوونەوە بە تـەواوی هەست دەکەین . بـەڵام هەموو پەلە قاژەیەکمان بێسوودە . هاتنە رەدامان ، دەردی دڵمان ، لە باوەش گرتنمان ، لاواندنەوەمان ، هەمـوو بێ کەڵکە ! کاتێك دەمانەوێ ئاوێزانی یەکتر بین ، لێك ئاڵێین ، خۆ لە باوەش هاویشتنمان تەنیا دەبێتە هۆی ئەوەی تێك هەڵەنگووین .

من هیچ کاتێك لەوکاتە خۆ بە تەنیاتر نابینم کە رۆچنەی دڵم بۆ دۆستێکم دەکەمەوە . چونکە باشتر ئەو پەرژینە بێ کەڵێنە دەبینم کە لە نێوانماندا هەیە . ئەو دۆسـتە ، لە بەرامبـەرمە ، چـاوە ڕووناکەکانی دەبینم کە لە منی بڕیون . بەڵام گیـانی لە پشت ئەم چاوانـەوە نابینم ! گـوێم دەداتێ ، بـەڵام بیر لـە چ دەکاتەوە ؟ بەڵێ بیر لە چ دەکاتەوە ؟ تـۆ هەست بەو ئازارە ناکـەی ؟ رەنـگ بێ لێم بێـزار بێ ، رقی لێ هەڵگرتبم ، یا گاڵتەم پێ بکا ؟ ئایا بیر لەوانە دەکاتەوە دەیانڵێم ، تیزم پێ دەکا ، یا بـە گێژم دەزانێ ! چۆن بتوانم بزانم چۆن بیر دەکاتەوە ؟ چۆن دەتوانم تێ‌بگەم ئەوەندەی خۆش دەوێم کە خۆشم دەوێ و لەم «سەر»ە خڕ و بچوکەدا چ لێکدانەوەیەك هەیە ؟

چ رازێکی سەر بە مۆرە بیرەکانی نەناسراوی مرۆڤێك ؟ بیری ون و ئازاد ، بیرێك کە ناتوانین رێبازی بۆ دیاری بکەین ، ناتوانین بەسەریدا زاڵ بین ، یا بیبەزێنین . من پێم خۆشە خۆم فیدا بکەم ، هەموو رۆچنەکانی گیانم بکەمەوە ، بەڵام ناتوانم . هەموو شتێك لە قووڵایی تاریکی « من »دا رادەگرم ، لەو قووڵایەدا کە کەس دەستی ناگاتێ ، کەس رێی تێنابا ، کەس نایدۆزێتەوە . چونکە کەس نیە وەك من بچێ ، کەسیش نامناسێ .

تۆ هیچ نەبێ ئێستا دەمناسی ؟ نا ، بەشێتم دەزانی ، تاقیم دەکەیەوە ، دوورم لێ رادەوەستی ، لە خۆت دەپرسی : « ئەمشە[illegible]ۆ وای بەسەرهاتوە ؟ » « ئەرێ ناسیومی ؟ » رەنگ[illegible]انی بۆ تاوێك بەختەوەرم بکەی !

ژنن ئەوەی دوورەپەرێزی خۆمم باشتر نیشان دەدەن .

چارە رەشی ! داماوی ! ئای چەندم ئازار لە دەست ژنان دیوە . چونکە زۆر لە پیاوان زیاتر هەستی « تەنیا نەبوون »یان بۆ پەیدا کردوم !

کاتێك پیاو تووشی «ئەوین» دەبێ هەست دەکا لە جاران پتر بەربڵاوترە ، هەست بە بەختەوەرێکی « بەرزتر لە بەختەوەری ئینسانی » دەکا . ئەو هەستە لە کوێوە پەیدا دەبێ ؟ لە وەێرا کە پیاو هەست دەکا ئیتر تەنیا نیە ، « دوورەپەرێزی » و تەرەکەمەیی دوایی هاتوە . چ هەڵەیەك ؟

ژن کە تاسەی « ئەوین » زیاتر لە ئێمەی ئازار دەدا درۆیەکی زلە ، بیرەخەوە . تۆ ئەو کاتە شیرینەی دەگەڵ ئەم کەزیە درێژە کولمە سوورە کە نیگای هۆشی پیاو دەرفێنێ رایدەبوێرم دەزانی چۆنە ؟

چ تراویلکەیەك چاوم فریودەدا ! چ بیرەخەوێك دەمباتەوە ! وا دەزانم من و ئەو تاوێکی دیکە مرۆڤێك زیاتر نابین . بەڵام ئەو تاوە قەت نایە . پاش چەند حەوتو چاوەنۆڕی ، هیوا ، شادی ، ، خۆشی ، رۆژێك لە پڕ خۆم لە هەمیشە تەنیاتر دەبینم . پاش هەر ماچێك ، پاش هەر لە ئامێز گرتنێك تەنیایی پتر دەبێ .

شاعیرێکی « سوولی پرود هام » دەنووسێ :

« لاواندنەوەکان جگە لە تاسەیەکی بەسام ، جگە لە پەلەقاژەیەکی ئەوینی داماو نین ، کە دەیانەوێ یەکەتی نامومکین لە نێوان گیان و لەشدا پێك بێنن » .

پاشان خوا حافیز ، تەواو بوو ، براوە ! پیاو هێشتا ئەو ژنەی کە بۆ ماوەیەك هەموو شتی ژیانی بووە ، نەناسیوە و لە هەستی دەروونی بێخەبەرە . لەوپەڕی نیزیك بوونەوە و تێکەڵیشدا لە قووڵایی گیانی ئاگادار نیە . وشەیەك تەنیا وشەیەك « هەڵە »ی پیاو ئاشکرا دەکا . وەك بروسکێکی لە تاریکیدا بیریسکێ ئەو کەندالە قووڵ و رەشەمان نیشان دەدا کە لە نێوانماندا هەیە .

دەگەڵ ئەوەش جوانترین دەمی ژیان ئەو دەمانەی شەوێکن کە لە پاڵ ژنی خۆشەویستمان بێ دەست بزێوی رایدەبوێرین . با بەرزەفڕ نەبین ، زێدە رەوی نەکەین چونکە هەرگیز دوو ئینسان نابن بەیەك .

بەڵام بۆخۆم بۆچی رۆچنەی گیانم ئاخنیوە ؟ هەرگیز ئەوەی لە بیرمدایە ، مێشکمی خەریك کردوە ، خۆشم دەوێ ، باسی ناکەم . چونکە دەزانم حوکمی تەنیایی هەتا هەتایەم دراوە . سەرنج دەدەمە هەموو شت بێ ئەوەی بیر و ڕای خۆم دەربڕم .

بیر و ڕاکان ، کێشەکان ، دیمانەکان ، بۆ من گرنگ نین . ناتوانم لە هیچ کام لە زەمینەکانی فیکریدا لەگەڵ هیچکەس هاوبەشبم .

چەند وشەی کورت و ساکار بۆ وەڵامی پرسیارەکانی رۆژانە بەکار دێنم . جاری وایە زەحمەتی وەڵام دانەوەش ناکێشم و هەر بزەیەك لێوەکانم لێك دەکاتەوە . تێم دەگەی ؟ لە مەبەستم حاڵی دەبی ؟

شەقامی درێژمان تا تاقی نوسرەتی « ئەتوال » پێوا بوو ، پاشان گەڕاینەوە ، چونکە دۆستەکەم ئەو قسانەی بە پەراوێزەوە ـ کە من لەبیرم نەماون ـ بۆ کردم . ئەویش زۆر بە کاوەخۆ !

دوایە راوەستا و لە پڕ دەستی بۆ لای ئەستوونی « گرانێتی » میسری کە سەرگورشتەی وڵاتەکەی بە خەتێکی سەیر لە پایەیی نووسراوە و لە پاریس لە نێو ئەستێرەکانی میسریدا بزرە راداشت . و قیژاندی :

« ـ ئێمە هەموومان وەك ئەو بەردەین ! »

بێ دەنگ و بێ ماڵ ئاوایی بەجێی هێشتم .

مەست بوو ، شێت بوو ، زانا بوو ، ئێستاش نازانم ! جاری وایە بیر دەکەمەوە هەقی بوو ، جاری واشە پێم وایە ئاقڵی نەمابوو !

# مادلین

نووسینی صادق هیدایەت
سیروان ۰۰۰۰ لە فارسی‌یەوە
کردویە بە کوردی

پێری شەو لێرە ، لەم ژوورە بچکۆلەیەدابووم کە هی میوانداری‌یە ، دایك‌و خوشکیشی لێرەبوون . دایکی بەرگێکی خۆلەمیشی‌و کچەکانیش جلی سووریان لەبەردابوو . بەرگی موبێلەکانیش مەخمەلی سوور بوو ئانیشکم دابووەسەر پیانۆکەو نیگام ئەکردن . ئێمە هەموو بێ‌دەنگ بووین . بەلام دەرزی‌ی گرامەفۆنەکە ئاوازی پڕجۆش‌و خەمناکی «کەشتیوانانی ولگا»ی لە قەوانە رەشەکەوە بەرزئەکردەوە ، گڤە گڤ‌و دەنگی با ئەهات ، نمەنمی باران ئەیدا لە شووشەی پەنجەرەکە ، خۆشی‌ی دێنا ، ئەم دەنگانە هەموو بەیەکەوە لەگەل ئاهەنگەکەدا ئەچرژان‌و تێکەل ئەبوون .

**مادلێن لەتەنیشتمەوە بە خەمباریو ماتی دانیشتبوو . دەستی خستبووە ژێر چەنەیو گوێی ئەگرت . من بەدزییەوە لە قژە بریسکەدارە خورماییەکەیو لە بازووی گۆشتنو گەردنو روخساری منالانەو ژیکەلەی ئەوم ئەڕوانی .. ئەم ماتو بێدەنگییەیم بە مەکرو دەهۆ بگای ئەهاتە پێش چاو . من وام بۆ ئەڕوانی پێویستە هەمیشە بزێو بێو رابکا ، یاریو شۆخیو گاڵتە بکات ... هەرگیز بە خەیاڵما نەئەهات ئەویش بیرئەکاتەوە ... باوەڕم نەبوو بەوەی رەنگە ئەویش لەوانەبێ خەم بخوات . زۆر شاییم بە منالّ ئامێزیو سەرەخەرێیەکەی ئەهات .**

ئەمە سێیەمین جارم بوو بە ئەو بگەمو ببینم .. یەکەمین جار لە کەناری دەریا بینیمو ناسیم . بەلام ئێستە وەك ئەوسا نییەو گۆڕاوە . ئەو وەختە لەگەڵ خوشکەکەیدا جلی مەلەکردنیان لەبەردابوو . زۆر رووخۆشو سەربەست بوون . ئەو منالکارو زۆرزان دیاربوو ، چاوەکانی ئەدرەوشانەوە .. خۆر خەریك‌بوو ئەنیشت ... شەپۆلی دەریا ، ئاواز ، گازینۆ ، هەمووی دێتەوە یادم .. کەچی ئێستا رەنگیان پەژموردەو ژاکاو ، بەم جلە سوورە ئەرخەوانییانەوە کە مۆدەی ئیمساڵەو دامێنێکی بەرزی هەیەو تا کەلەموستی پێیان دائەپۆشێ خەمبارو سەرپڕ لە خولیای ژیان دیارن .

**ئاوازی قەوانەکە بەو دەنگە دوورو هێمنەیەوە کە لە زایەڵەی شەپۆلی دەریاوە دوور نەبوو ، وەستا . دایکیان بۆ گەرمکردنی کوڕەکە دەستی کردە باسی قوتابخانەو کاروباری کچەکانی .. ئەیووت : مادلێن لە رەسمدا یەکەم قوتابی بووە . خوشکەکەی سەیرێکی منی کرد . منیش بە رووالەت زەردەخەنەیەك گرتمیو وەلامی کورتو سەرپێیی پرسیارەکانیانم ئەدایەوە .**

**بەلام هۆشم لەلایەکیتر بوو ، هەر بیرم لای ئەو ساتەبوو کە بۆ یەکەمجار ئەمانم تیاناسی ..**

دوو مانگ پێش پشووی هاوینی پار ، چووبووم بۆ کەناری دەریا : لەبیرمە لەگەڵ هاوڕێیەکمدا سەعات چواری پاش نیوەڕۆ بوو ، هەوا گەرم بوو ، بە خاوە خاو چووینە «ترووڤیل» لای ئێستگەی شەمەندەفەرو تەکسییەکمان گرت . بە کەناری دەریادا لەناو دارستانەکەدا تەکسییەکە لەناو سەدان ئوتومبیلو لەناو زایەڵەی هۆڕنو بۆنی ئەو رۆنو بەنزینەدا کە بە هەوادا پرژو بلاو بووبووەوە .. ئەخزاو تەکانی ئەدا .. دیمەنی دەریا ، دوور بەدوور لە پشتی درەختەکانەوە دەرئەکەوت .

دوایی لە یەکێ لە ئێستگەکاندا پیادە بووین ... ئێستگەی (ویلرویل) بوو ، بە چەند رێگایەکی بەرزو نزمدا ، کە دیواری بەردو گڵ بە هەردوو لایدا کشابوو رابووردین . گەیشتینە سەر (پلاژ)ێکی بچکۆلە کە وەك نانێکی تەفتوونی لە بەرزایی کەنار دەریادا دروستیان کردبوو . لە مەیدانی نزیك دەریاکەدا گازینۆیەکی بچکۆلەش دیاربوو . لە کەمەری ئەولای گردەکەوە چەند خانوو و کۆشکیلەیەك دروستکرابوو ... پێینی کەناری دەریاکە لمی وردو نەرم بوو . ئاوی دەریاکەش تۆزێ لەولاترەوە شەپۆلی ئەدا . منالی وردیلە لە کەنارەکەدا بەتەنیا ، یا لەگەڵ دایکیاندا خەریکی تۆپتۆپێنو شەڕە لم بوون . کۆمەڵێ ژنو پیاویش بە مایۆو کراسی بەدەن چەسپیانەوە خەریکی مەلەکردن بوون ... خۆیان ئەخستە ئاوەکەوەو ئەهاتنە دەرەوە ، کۆمەڵێکیتر لەناو لمەکەدا دانیشتبوون ، هەندێ راکشابوون ، خۆیان دابووە بەر هەتاوەکە .. پیاوە پیرەکانیش لەژێر چەترە رەنگینو خەت‌خەتەکاندا رۆژنامەیان ئەخوێندەوەو لە



ژێریشەوە بە تیلەی چاو سەیری ژنەکانیان ئەکرد . ئێمەش چووین‌و لە نزیك گازینۆکەوە پشت لە دەریاو لەسەر لێواری بەرزی بەستێکی پان کە بەرەو نزیکی ئاوەکە ئەکشا ــ دانیشتین ، هەتاو لە ئاوابووندا بوو ، ئاوی دەریا بەرز ئەبۆوە .. شەپۆلەکانی ئەگەیشتنە کەنار ، تیشکی ڕۆژ لە شەپۆلەکاندا لە شێوەی سێ گۆشەیی پۆپەی درەختێکدا ئەدرەوشایەوە .. کەشتی‌یەکی گەورەی رەش پەیدابوو .. لە نێوان تەم‌و هەڵمی دەریادا بۆ بەندەری (لوهاور) ئەڕۆیشت . هەوا تۆزێ ساردی‌کرد .. ئەوانەی لەو کەنارە بوون وردە وردە بەرەوژوور هەڵئەکشان . لەم‌کاتەدا دیم



هاورێکەم هەستایە سەرپێ‌و دەستی ئەو دوو کچەی گوشی کە لێمان نزیك ئەبوونەوەو منیشی پێ‌ناساندن ، ئەوانیش لە تەنیشتمانەوە لەسەر لێواری بەستەکە دانیشتن ..

**(مادلێن) تۆپێکی گەورەی بەدەستەوەبوو ، لە نزیك ئێمەوە دانیشت‌و دەستی‌کرد بە قسەکردن ، ئەتوت دەمێ سالە ئێمە ئەناسێ .. تاوێ هەڵئەستاو بە تۆپەکەی ، دەستی ئەکرد بە یاری کردن‌و دواییش ئەهاتەوە . دیسان لەلامانەوە دائەنیشت . من بە گاڵتەوە تۆپەکەم لەدەستی ڕائەکێشاو ئەویش ڕای‌ئەکێشایەوە ، دەس[illegible]ان لە دەستی یەك ئەکەوت‌و کەم‌کەم دەستی یەکتر[illegible]ئەگوشی ، دەستی ئەو گەرمایی‌یەکی خۆشی هەبوو . لەژێرەوە ئەمڕوانی‌یە سینەو پووزو سەرو گەردنی . بەخۆمم ئەوت مشەیە سەر بنێمە ناو ئەو سینەو مەمکەی‌و لەم نزیك دەریایەدا تێر بنووم .. خۆر نیشت ، مانگی ڕەنگ پەڕیو ، تینی یەك ماڵی‌و خێزانی‌یەکی سەیری بەم پلاژە بچووك‌و لە هەموو شوێن دوورو پەرتە بەخشی‌بوو ...**

لەناکاو ئاوازی سەما لە گازینۆکە هەڵسا ، (مادلێن) دەستی لەناو دەستمابوو ، گۆرانی‌ی سەمایەکی ئەمریکایی ، گۆرانی‌ی (مسی‌سپی) ئەوت . دەستیم ئەگوشی ڕۆشنایی چرای دەریا لە دوورەوە ، نیوە جوغزێکی ڕۆشنی لە ڕووی ئاوەکەدا کێشابوو . هاژەی شەپۆلی ئاوی دەریاکە هورووشی بۆ کەنار ئەهێنا ، .. ئەبیسترا ، تارمایی ئینسان بە نزیکماندا ڕائەبورد ..

ساتێ ئەم دیمەنانە بە بەرچاوما تێ‌ئەپەڕین ، دایکی هات‌و لەنزیك پیانۆکەوە دانیشت . من خۆم دایە کەنار ، لەپڕا مادلێن وەکو لەخەو ڕاپەڕیبێ بەرزەپێ هەستا ، چوو نۆتە مۆسیقاییە پرژو بڵاوەکانی دا بە یەکداو یەکێکی لەو نۆتانە جیاکردەوەو خستیە بەردەمی دایکی‌و خۆشی هات بە ڕوویەکی گەش‌و پێکەنیناوی‌یەوە لای منەوە وەستا . دایکی دەستی کرد بە پیانۆ لێدان (مادلێن)یش بەهێمنی گۆرانی‌ی ئەوت ، ئەمە هەر ئەو ئاوازی سەمایەبوو کە لە (ویلرویل) بیستبووم ، هەر گۆرانی (مسی‌سپی)یەکەیە .



چیرۆکی ژمارە

# خۆشەویستی کورتۆکی نابا

شێرزاد حەسەن

— مام وسو .. مام وسو ..

— بەڵێ گەورەم !

— زوو وەرە بە پەلە .. واز لەم ئیشانە بێنە بە دەستتەوە .. باشترە پاڵێك بە عارەبانەکەمەوە بنێی . ئەمەوێ تۆزێك بچمە سەر شەقامەکە . ئێوارە داهاتو با جێگاکەم بگۆڕمو تەماشای هاتو چۆکەرەکان بکەم . لێرەدا مردم لە بەیانیەوە .. ئەڵێی شین بووم .. تف لەم ژیانە کە ئەوەندە بێ مانایە !!!

— . هاتم گەورەم !

لەو کاتەدا مام وسو وتی (هاتم گەورەم) سێو چوار ئیشی بەدەستەوە بوو ئەبوایە تەواوی بکردنایە . لەلایەك ئۆتۆمبێلەکانی ئەشت . لەلایەکی ترەوە چیمەنەکەی ئاو ئەدا . لەلایەکی کەوە ڕەوە کۆترەکانی دان ئەدا . لەلایەکی ترەوە .... هتد . بە هەر حاڵ

## خۆشەویستی

## کورشوشی نابا

مام وسو لەم کۆشکە پان و بەرینەدا لەسەر یەك قاچ لەسووڕایەوە .. وەکو هەنگ پشووی بۆ نەبوو ئیش و کاری چوار خزمەتکاری لەسەر شان بوو ، هەمیشە ئازایانە ڕای ئەپەڕاند وەك هەر هەژارێك نانی زار پەیدا بکات و بێ منجە منج ڕێگای ماندوبوون بگرێتە بەر !

ئەو کەلەشەی بانگی مام وسوی کرد وەکو تەرِك لەسەر عارەبانەیێکی بچووك و جوان ئارایشت کراو کەوتبوو ... عەرەبانەکەی لەو عارەبانانە ئەچوو کە دەوڵەمەندەکان منداڵە ساواکانیان لەکاتی ڕابواردن و پیاسە کردنا تێ ئەخەن ... بەڵام ئەم توندو پوختەو بەهێزتر بوو . لە هەموو لایەك بە بزماری زەردو تروسکەدار بزمار ڕێژکرابوو .. بە قایش و قروشێکی رەنگاو رەنگ پێچرابوو .. لە ئۆتومبێلێکی مارسیدس زیاتر خزمەت ئەکراو بایەخی پێ ئەدرا .. عەرشی بەرزی کەلەش زلەکە بوو کە ڕۆژ هەتا ئێوارە لێی دانەئەبەزی !!

جەستەی ... جەستەی زۆرانبازێك بوو .. ناوشان پان .. کەللە سەرێکی زل ، پرچێکی قژن لوولی خواردبوو بەسەریەوە .. ورگێکی خڕ ، ئەویش سەرمایەی نەجوولانەوەو ڕۆژی پێنج ژەم خواردن و خواردنەوە .. جووتێ زولفی ئەستوور بەلای گوێچکەکانی‌دا شۆڕ بووبوونەوە زۆر لە دەسکە کەوەر ئەچوون . دیمەنی لە پیرێك ئەچوو خۆشی سی بەهاری نەدیبوو !!! نەتئەزانی ئەم کەلەشە گەورەیە بۆ خۆی هاویشتۆتە کۆشی ئەم عارەبانەیەو وا بەم جۆرە دەخیلی بووە . بەڵام کە ئەتدی ، مام وسوی خزمەتکار لەسەر خۆ پاڵ بە عارەبانەکەیەوە ئەنێ .. ئەتزانی کەوا قاچەکانی مردووە !!!

کەلەش زل هەر لە منالی‌یەوە تووشی ئەم نەخۆشی‌یە ترسناکە بووبوو . چەندجار بردبوویان بۆ دەرەوەی وڵات بۆ چارەسەرکردن ، بەڵام بێ‌سوود بوو .

گەورەترین کۆشك و تەلاریان لەشار هەبوو .. چەند ڕیزە دوکانی ناوبازاڕ ، گەراج ، سینەما ، سێ ئوتومبێلی تایبەتی بۆ ماڵەوە ... هتد . باخچەی ناو کۆشك لەو بەهەشتە ئەچوو کە هەژارەکان خەونی پێوە ئەبینن . کەچی لالای ئەو هەمووی ئەگۆڕێتەوە بە دوو قاچی ساغ ... تەنیا دوو قاچ !!!

سەبووری خۆی [illegible] ژمارەی ئەوانە ئەدایەوە کە وەك خۆی تووشی نەخ[illegible]ی ئیفلیجی بووبوون لە شارەکەدا . مام وسوش شارەزای بوو ، هەر مانگێك ناوو نیشانی ئیفلیج بووێکی‌تری بۆ ئەهێنا . ئەوان جیاوازی‌یان هەبوو .. خۆی تاکە دەوڵەمەندی شار بوو ئەم نەخۆشی‌یەی بێ . ئەوانی‌تر ڕەش و ڕووت بوون و سەربەستی‌یەکی تەواویان هەبوو . سەر لە ئێواران بە عارەبانەکانیان بەسەر شەقامەکانا ئەخولانەوەو هەوایان ئەگۆڕی .. بەمە چەشنە ڕەزامەندی و خۆشی‌یەك لە چاوەکانیان ئەباری . ئەویش بە چاوێکی کزەوە سەیرێکی ئەکردن و ئاخێکی هەڵئەکێشا کە وەك ئەوان ناتوانێ بەهەوەسی خۆی شەقامەکان تەی بکات چونکە هەموو کەس ئەیناسێ و پەنجەی بۆ درێژ ئەکەن و بگرە ئەیکەن بە نموونەش :

— بزانن .. ماڵ و سامان و دارایی چی‌یە .. چ قیمەتێکی هەیە ؟ پیاو با موڵکی دنیای هەموو هەبێ کە ئیفلیج بوو چ نرخێکی هەیە ؟ پیاو هیچی نەبێ بەڵام لەشی ساغ بێ ... ئەی کاکی خۆم !!

ئەوەی ئازاری ئەداو گیانی ئەهێنایە لەرزین ئەوە بوو یەکێك لەم ئیفلیج بووانە هەموو ئێوارەیەك لەسەر عارەبانەیەك بەو شەقامەدا تێ ئەپەڕێ کە مەڵبەندی سەرنج و تەماشای ئەم بوو .. ئەم دیمەنە ئەیهێنایە وڕێنەکردن :

— خۆ ئەم کابرایە وەکو من تووشی ئەم نەخۆشی‌یە

←



بووه ، بەڵام زۆر بـە سەربەستی‌یەوە هەمـوو ئێواران پیاسە ئەکا ، بێ‌ئەوەی شەرم لەکەسێك بکات .. سەیرێکی منیش ئەکات وەك پێم بـڵێ (دەك داوەشێ‌ی کە ڕۆژ هەتا ئێوارە لەسەر ئەم عارەبانەیەیت‌و لە هەمان جێگای خۆت نابزوێیت .. ترسنۆك .. لە فستە فستی خەڵك ئەترسی .. لەو کماتیە ئەترسێ‌ی کە خۆت بەسەر خۆتتا نەهێناوە بەڵکو خوا بەسەریا هێناوی !!) .

خۆ هەزار زۆر جار سەربەستی‌ی لە دەوڵەمەند زیاترە .. ناوێـکی ئەوتۆی نیە شـەرم بکات لـەوەی ناوەکەی ئەڕوات .. دەوڵەمەند لە نەخۆشیشا هـەر شکەستە .. هات بە بیریا چی‌تر نەهێڵێ ئەم کابرایە بەو شەقامەدا تێپەڕێ‌و ببێتە هۆی ئازاری .

— مام وسو .. ئەم کابرایە ئەناسی کە هەموو ڕۆژ لەسـەر ئەم عارەبانـەیە بە پێش لـۆزی منـدا تێ‌ئەپەڕێ ؟

— بەڵێ قوربان .. ئەوە (حەمە)ی ئاشـەوانە .. ئەو بەستەزمانە هەردوو قاچی بەر قایشی ئاش کەوت .. قاچێکی بڕایەوەو قاچەکەی‌تری دەمارە گەورەکانی پچڕان‌و لەکار کەوت . قوربان کاتی خۆی پیاوێکی یەکجار بلیمەت‌و چاو نەترساو بوو لە گوندێـکا پێکەوەبووین .. باوەڕ بکە لـە ئاغا نەئەگەڕایەوە ، بەڵام چی‌ئەکەی لەگەڵ گەردوون کە ئێستاکە وا لەکاری خستووە .

— مام وسو .. من نەموت تۆ سەرگوزشتەی ژیانی حەمە سوالکەرم بۆ بگێڕەوە .. من وتم ئەیناسی‌و بەس . چ حەددێکی هەیە لەگەڵ ئاغا فزە بکات .

— قوربان .. سوالکەر نی‌یە ، کابرا ئێستاش بـە دەست‌و بە ددان ئیش ئەکات‌و منالەکانی بەخێو ئەکات .. لەوەتەی وای لێ‌هاتووە خۆی فێـرە تەون کردووە .

بەم سەرگوزشتەیە کەلەش زل دەمارەکانی جووت بوون‌و بیری چۆوە ئەوەی مەبەستی بوو بیڵێ .. بۆیـە بێ‌دەنگ بوو . کـە بێ‌دەنگیش ئەبوو لە هەمـوو کاتێ سامناکتر ئەبوو .. غەم لە چاوەکانی وەکو گوڕی ئاگر لە تەنوور بێتە دەرەوە ، ئەهاتە دەر . گرنگترین شت لای ئەو ئەوەبوو چۆن خۆی لە زاری کراوەی نەهەنگی کات قوتار کات . کات لای لەجیاتی‌ی ئەوەی بەسـەر سەعات‌و دەقیقەدا دابەش کرابێ ، بەسەر غەم‌و ئازارا دابەش کرابوو . هەر چرکەیێك ئازارێکی توندو تیژو لەسەرخۆ بەسەر هەستیا تێ‌ئەپەڕی ! هەر ئازارێـك

## خۆشەویستی
## کورشوشانا

شانەیەکی دان ئاسن بوو لە جەستەی گۆشتنی ئەچەقی‌و هێواش هێواش گۆشتەکەی شانە ئەکرد .. تا وای‌لێ‌هات ئەو ڕۆژە سەعاتەکەی مەچەکی لێ‌کردەوە بۆ ئەوەی چی‌تر لەکات نەگات . هەر دەمەی بەشتێکەوە خەریك ئەبوو . سەردەمێ خووی دایە خوێندنەوەی ڕۆمانە بەرزەکانی جیهانی ، بەڵام جارێ نەیتوانی بگاتە کۆتایی‌و توورِ تێی هەڵئەدا . چەند مانگێك خەریکی ڕاوچێتی‌بوو . ساچمەیەکی بە دەستەوە ئەگرت‌و نیشانەی ئەگرتە ئەو باڵندانەی ڕەوە ڕەوە ئەهاتنە سەر لکی دارە بەرزەکانی ناو حەوشەکە . مام وسوش چەقۆیەکی بچووکی بەدەستەوە ئەگرت ، هەر کاتێ بانگی لێ‌ئەکرد :

— مام وسو .. فریا کەوە کوشتم .. زووبە سەری ببڕە پێش ئەوەی مردار ببێتەوە .

مام وسوش بە هەڵەداوان تاوی ئەدایە باڵندەکە کە لەژێر دەستیا فڕکە فڕکی ئەکرد . لەسەرخۆ چەقۆیەکی بە ملە لاوازەکەیا ئەهێناو سەری لە لەشی جیا ئەکردەوەو ئەیوت :

— دەست خۆش .. گەورەم .. دەست خۆش !

زەردەخەنەیەك ئەکەوتە سەر لێوی .. زەردەخەنەیێکی تێکەڵاو بە غەمێکی بزرو قووڵ ، بەڵام کە باڵندەیەکیش ئەکەوتە بەر ساچمەکەی هەستی بە سەرکەوتنێکی بێ‌پایان ئەکرد .

— مام وسو .. نیشانەم زۆر ڕاستە .. ئەبینیت باڵندەیەك ڕزگار نابێ .. بەسەری تۆ دەرزی هەڵئەگرم !

ژن‌و خۆشەویستی لای کیشوەرێکی نەدۆزراوە بوو . بەردەوام مەزگیرانی بە زەردەخەنەی شۆخێك ئەکرد ، لە هەرلایەك عەبا ڕەشێکی بەدی بکردایە ، ملە ئەستوورەکەی بۆ ئەسوڕاند تا لە حوکمی چاو دوور ئەکەوتەوە . کە ئێواران لەسەر عارەبانەکەی ئەخشایە لای شۆستەی شەقامەکە .. چاوەڕوانی ئەوەبوو کچە قوتابی‌یەکان هەر ئێستا لە قوتابخانەکەی نزیك کۆشکەکەی ئەوانەوە ئەگەڕێنەوە . کچە قوتابی‌یەکانیش پۆل پۆل .. سێ لەوێ ، چوار لەوێ قۆڵیان لە قۆڵی یەکتر ئاڵاندبوو .. چەشنی سەرو ، ئەلەرینەوە ، بە دەستێکەوە جانتا ڕەشەکانیان خستبووە سەر **مەمکی** چەپیان .. کە تیشکی ن[illegible] ڕۆژ وەکو باران ئەپرژایە سەر دەم‌و چاویان پێستی[illegible]یان ڕەنگێکی ئاڵی لەگەڵ تێکەڵ ئەبوو .. پاکی جل ڕە[illegible] ، ئەمەش سپییەتی‌ی قۆڵ‌و مەچەك‌و ڕوویانی بەهێزو ڕوح کێش‌تر ئەکرد .. نەرم نەرم بە پێش چاوی کەلەش زلەکەدا بەرەو ماڵەوە ڕێچکەیان ئەبەست . کە پێ‌ی نازیان ئەنایە سەر زەوی .. هەستی ئەکرد پێ ئەنێنە سەر دڵی ئەو . داوای لە مام وسو ئەکرد پاڵی پێوە بنێ بۆسەر ڕۆخی شەقامەکە بۆ ئەوەی لە نزیکەوە لە ڕوانینی ئەم دیمەنە قەشەنگە تێر ببێت . کچە قوتابی‌یەکانیش کە ئەگەیشتنە لای بە چاوێکی پڕ لە بێ‌باکی سەیرێکی ئەم کەلەشەیان ئەکردو جار جاریش سەریان لەبن گوێ‌ی یەکتر ئەناو دەستیان ئەکرد بە چرپە چرپ . ئەویش وای لێك ئەدایەوە کە باسی ئەو بکەن (ئاخۆ چۆن باسی ئەکەن ؟) .

کە کچە قوتابی‌یەکان لەبەرچاوی بزر ئەبوون .. نۆرەی ئەوە ئەهات سەرەتاتکێ لەگەڵ ئەو کچە خزمەتکارەی بەرامبەر کۆشکەکەیان بکات ! ئەم چاو بازی‌یە لایەنێکی بۆشایی‌یەکەی گیانی وەك بیابان چۆڵ‌و هۆڵی پڕ ئەکردەوە . کە ئادەمیزاد لە ژیان کەوت‌و کەمایەتی‌یەکی لەخۆیا دی دەست پێ ئەکا تام لە شتی بێ‌مانا وەرئەگرێ ! بۆ ئەو شتێکی لێ دەرنەچوو .. بۆ نەبوو بە هونەرمەندێکی بەناوبانگ ؟ خۆ بیتهۆڤن کەڕ بوو کەچی جوانترین سیمفۆنیای دانا .. (بایرۆن)ی شاعیر شەل بوو .. تەها حوسەین کوێر بوو ! زۆر لە مەزنەکانی جیهان پەككەوتو بوون . کەمایەتی زۆرکەسی

←

گەیاندە بەرزترین پلە ... بەڵام ئەم ( نەء ) !!! نەبوو بە هیچ .

ئەو ڕۆژە مام وســو نەرم لەســەرخۆ پاڵی بــە عەرەبانەکەوە ئەنا بۆ سەر شۆستەی شەقامەکە ، بــۆ ئەوەی ئەم وەك هەموو ڕۆژ[ـ]ـــەیری هاتوچۆکەرەکان بکات .. لە پڕێکا وتی :

ــــ مام وسو .. تۆش ما[ندو]و بووی لەگەڵ من هەموو ڕۆژێ ئەمهێنیو ئە[illegible] وەك ......

نیازی ئەوەی هە[بو]و بڵێ ( وەك بڵێ پاڵ بە مناڵی ساواوە ئەنێی ) .. بەڵام ئەم ڕستەیە لەسەر زمــانی زۆر گران بوو ، شاردییەوە . مام وسو هەرچەندە لــە هیچ قوتابخانەیــەك نەیخوێنــدبوو بــەڵام دەرچــووی قوتابخانەی ژیان بوو .. پیاوێکی بەساڵاچوو دنیا دیتە بوو هەر لە هەورازو هەر لە نشێو ! بۆیە هەوڵیدا ئەم باسە بگۆڕێ کە برینی کەلەش زلەکە ئەکولێنێتەوە .. ئەم باسە پڕبوو لە تەزووی تاڵو موچڕکی ئازار .. بەڵام بۆی‌نەکرا چونکە لەوەدابوو باسێکی‌تر بدۆزێتەوە ئەو دووبارە وتی :

ــــ مام وسو .. ماندوو نەبووی ؟!

ئەمجارە ئەو دەنگە لە کەلەشەکە هاتــە دەرێ ، وە کەدەنگێ وابوو کە لە ئەشکەوتێك بێتە دەرەوە .. مام وسو ئەیزانی ئەو زۆری باك بەوە نیە کە ماندوو بێ یان نا .. بۆیە بە گرانی وەڵامی پرسیارەکەی دایەوە :

ــــ نەخێر گەورەم .. من ئامادەم بۆ هەر خزمەتێك



## خۆشەویستی
## کوزنشوش نابا

ــــ بەڵێ گەورەم .. ( زوو ویستی ئەم باسە بگۆڕێو ئەم پەڕە ڕەشە هەڵداتەوە .. بەری ئەم کانیە بگرێ کە سەرچاوەکەی تەقینەوەی زامێکی کوشندەیە ) :

ــــ قوربان .. براکانت دیارنین . سێ چوار ڕۆژە نایانبینم . زۆر غەریبی‌یان ئەکەم ؟!

ــــ بەخوا .. هەرسێکیان ڕۆیشتوون بۆ دەرەوەی وڵات ( حەزی نە[illegible] بزانێ کام وڵات چونکە لای مام وسو هەموو یە[illegible]نگە ! ) .

ــــ گەورەم .. بۆ ؟ ئیشیان چی‌بوو لە دەرەوە ؟

ــــ هەر بۆ ڕابواردن . ڕابواردنو بەس ! ( ئەمەی وت سوور بووەوەو سەر لووتی ئارەقی کردو دەنگی بڵند کردەوە ) .. مام وسو تۆ ئاگات لە دەمت بێ . تۆ هەقت نیە هەموو پرسیارێك بکەیت .. تۆ خزمەتکاریتو بەس !

مام وسو وەك هەر ئادەمیزادێکی هەست ناسكو هەژارو چەوساوە شەرمی لەخۆی کردو بەسەر خۆی داشکایەوە .. وتی :

ــــ بمبوورە گەورەم .. نەمزانی .. وا تێ‌گەیشتم بە ئیش چوون بۆ دەرەوە .

کەلەش زلەکە هەستی بەوە کرد کە توانی بە وشەیەك ئادەمیزادێ دەم‌کوت کات .. ئادەمیزادێکی ساغ .. دیارە بەهێزە .. نا هەر بەهێزە هەرچەند دوو قاچی مردووی هەیە . لە ژیانا هەندێ کەس کە بروایان بەخۆیان نەما ، داوی نێوان ئەوانو ژیان پچڕا .. لە ڕێگای شتی بچووکەوە ئەیانەوێ ئەم بۆشاییە پڕکەنەوە .. باسی سێ براکانی .. کەلەش زلەکەی برد بۆ جیهانێ کە ئەو لێی دوور بوو . هەر لەبەر خۆیەوە ، لێوی نەئەجوولایەوە نەوەك کەس بزانێ بیر ئەکاتەوە :

←



..جگە لەوەش کە عەرەبانەکەت لە قەمەرەیەك خۆشتر ئەڕوا ... باوەڕ بکە حەز ئەکەم لەجێگاتا دانیشم !

ــــ نا .. مام وسو .. باوەڕ ناکەم کەس حەز بکات لە جێگای منا دانیشێ گەر وەك من تووشی ئەم نەخۆشی‌یە نەبووبێ .

مام وسو دووبارە زانی ئەم باسە زۆر بڤەیەو بە کورتی ئەیویست بیبڕێتەوە .. بە وەڵامێکی کورت کۆتایی پێ‌هێنا :

ــــ تەنیا من لێرە ماوم .. وەکو مردوو .. ئەڵێی پەیکەرم لەم کۆشکەدا چەقیوم .. ژیان لەم کۆشکەدا چەندە بێ‌مانایە . ئێستا ئەوان هەرسێکیان لەسەر جوانترین بلاج ڕائەبوێرن . شۆخترین‌و جوانترین قژ زەردی ئەوروپا لەگەڵیاندا هونگاو هەڵئەهێنێت . لێرەش ژن‌و منداڵ ، لە دەرەوە هەموو شت . بۆنەگریم بۆخۆم .. منی بێ‌سێبەر .. هەموو ڕۆژ هەزار جار لەسەر ئەم عەرەبانەیە خۆم بۆ خۆم ئەخۆمەوە ، بەسەرخۆما ئەڕشێمەوە . بۆ وام لێ‌هات ، من جیاوازیم چی‌یە لەوان .. لە هەرسێکیان .. چ گوناهێکم کردبوو خوایە . بۆ هەتا ماوم ژیان لەسەر ئەم عارەبانەیە بەرمە سەر ، چونکە تووشی ئیفلیجی بووم . ماڵی دنیا بخەمە کۆشی هەر کچێ شووم پێ‌ناکات . ئاخ .. بۆ دوو قاچی ساغ .. ئەم هەموو ماڵە ئەگۆڕمەوە بە دوو قاچی ساغ .. ئەوانەی قاچیان ساغە بۆ نرخی نازانن ؟ . خۆزگە خەڵك وەکو من ئەبوون ئینجا ئەیانزانی قاچ چەندە پێویستە . بۆچی نەبوونی شتێ ئادەمیزاد وا شڕ ئەکاو لە ژیان بێ‌بەشی ئەکا ؟ چەند ناخۆش‌و چەند گرانە کە لە سۆزو جوانی‌و خۆشەویستی‌ی ژن دوورم ! چاکیش ئەیزانی ئەگەر ساغیش بوایە لە هەرسێ براکانی خراپتر ئەبوو . ئەو وەختە سۆز چی‌یەو ؟! کێ خۆشەویستی بە فلسێ ئەکڕێ‌و وەك براکانی هەر بەدوای ڕابواردنا ڕای‌ئەکرد ! شریتی ئەم خەیاڵەی پچڕاو شتێکی هاتەوە یاد کە تۆزێ دڵی خۆش‌کرد ... ڕووی پرسیاریشی لە مام وسو کردو خۆشییەکە لە ئەنجامی ئەم پرسیارە دابوو :

ــــ مام وسو .. هەفتەیەك لەمەوبەر کچێك هاتە لات ، هەندێ خواردنی بۆ هێنای ئەوە کێ‌بوو ؟!

مام وسو بە گومانەوە وەڵامی دایەوە وتی :

ــــ قوربان .. کچی من بوو !



ــــ چەند جوان‌و ژیکەلە بوو .. کچی وات هەیەو بێ‌دەنگی ؟

مام وسو تۆزێ شلەژا بۆ قوربان .. خێرە ؟

ــــ نا .. هیچ نیە .. بەس قسەیە ، کچێکی پیس‌و پلۆخ نیەو بە خاتوونان ئەچێ !

ــــ قوربان .. دایکی خاتوون بوو ڕەحمەتی خوای لێ‌بێ .. جگە لەوەش حەوت هەشت ساڵ لە قوتابخانە خوێندوویەتی‌و فێری نازو فیزو شتی

# خۆشەویستی
# کورشوش ئابا

جوان بووە .. بەڵام کە دایکی مـرد دەرمهێنا بۆ خزمەتی خـۆمو منداڵەکان .. دەسـت کورتیش قوربان خۆت ئەزانی !!

— بەداخەوە مام وسو .. با بگەڕێتەوە بۆ خوێندن . من یارمەتیت ئەدەم .. کچەکەت ماقوڵو لایقە !!

— خوا دەست بە عومرتەوە بگرێ .. ئیستا کەڵکی نەما ، وا گـەورە بووە ، هـەر موودەتێکیتـرە ئەینێرمە ڕێگەی خۆی !

کەلەشە سرو زلەکە ئەوەی بە نێچـیرێکی باش دایە قەڵەم . لێوی خۆیٚ تەڕکرد ، لچو لێوی ئازایەتی خڕکردەوە سەر یەکتریو وتی :

— مام وسو .. تۆ لە مێژە لای ئێمە ئیش ئەکەیتو خراپەمان بـۆت نیە لە چاکە زیاتـر . باشیش ئەزانی کە من چەند لە مێژە هەوڵ ئەدەم ژنـێ بێنم ئاگای لێمبێ بەڵام هەر کچێ بەم شێوەیـە ئەمبینێ لێم دوور ئەکەوێتەوە . منیش بێـزار بوومو تەمەنیشـم وا ئەڕوا . تـۆش کابرابەکی هەژارو دەست کورتی . ئەگەر بێتو کچەکـەت ڕازی بکەیت شووم پێبکات ، مانگانەکەت زیاتـر ئەبێو کچەکەشت لەو خانووە بە قوڕو ڕووخاوەوە دێتە ئەم کۆشکە خۆشە کە ئەڵێی بەهەشتە !

مام وسو سەری سوڕما ، چۆن وەڵامی بداتەوە :

— ئاخر ... ئاخر ... ئا ...

— ئاخرو ماخر نیە .. ئەگەر نەتوانی ئـەوە بکەیت چۆن باوکێکی ؟ با پێت بڵێم مام وسو گەر ڕازی ی نەکەیت .. چیتر لێرە ئیشت چنگ ناکەوێ .. ئیتر کەیفی خۆتە !

— قوربـان ئەویش هـەرچەندە کچـە .. بـەڵام ئادەمیزادەو حەز ئەکا بە ڕەزامەندیی خۆی شوو بکات . لە پڕێکا مام وسو دەماری جووت بوو .. وتی : قوربان تۆ خۆشبیت ئیش زۆرە . ئەگـەر تۆ ئەمترسێنی بەدەرکردن ، مەیدانی کـار زۆر بەرینە .. پیاوێکە دەستی هەبوو .. لەشی ساغ بوو .. هەرگیز ناپاڕێتەوە !

کەلەش زلەکە [illegible]زاری کرد :

— بەس .. بەس .. [illegible]ـرەوە .. چەنـد زمانیان درێژە ، لەبرسا ئەمرنو قسـەشیان ئەوەنـدە گەورەیە .

مام وسو ئەو ڕۆژە ماتو بێدەنگ بوو . کە شەو گەڕایەوە ماڵ ، پاش پشوودانو نان خواردن ئـەوەی قەومابوو بۆ کچەکەی گێـڕایەوە . کچەکەش بـەدەم گریانەوە ڕووی کردە باوکی :

— باوکە گیان .. من کەسم نیە تۆ نەبێ .. بـیکە بەخاتری خوا ، ئەمەم لەگەڵ مەکە .. بمکـوژە لام خۆشترە .. ئەوە هەمووی درۆیە .. درۆیە ، بەخوا ئەگەر ساغبوایە منی نەئەویست .. منی ئەوێ بۆ خزمەت کردنو ڕابواردنی شەو . بـۆ دامرکاندنەوەی تینوێتی ، چی لە کۆشکو زێـڕ بکەم لەگـەڵ مردوویەك وەك منالی سـاوا ئەبێ خزمەتی بکەم .

مام وسو پیاوێکی لەسەرخۆو تێگەیشتو بوو . لەو کەللە ڕەقانە نەبوو کە بە زەبری خەنجەر هەمـوو شتێ پێك ئەهێنـن . زۆر چـاکیش ئەیزانی ئەگـەر کچەکەی بدا بەم کەلەش زلە .. ژیانی ، بەفیڕۆ ئەڕوا .

— بەس کچم .. نازانم چیبـکەم .. دانیشم ئـاو ئەمبا ، هەلـسم گورگ ئەمخوا . خۆ ئەگەر شووی

←



پێ‌نەکەیت دەرم ئەکاو ئەبێ ڕێی مەیدانی کار بگرمە بەر !

— هەرچۆنێ بێ .. باوکە گیان .. من شووی پێ ناکەم ، پێی بڵێ ئەتوانێ هەموو شت بکرێ بەڵام خۆشەویستی‌ی منی پێ ناکرێ !

بۆ بەیانی کە گەڕایەوە .. کەلەش زلەکە هێشتا لەخەو هەڵنەسابوو .. کە هەستا .. پاش نان خواردنی بەیانی .. دی مام وسو کز دیاربوو . پێی وت :

— مام وسو .. خێرە .. لچت شۆڕە ، شێری یان ڕێوی ؟

— گەورەم .. بۆ لچم شۆڕە ؟ ئەمە مەسەلەی شێرو ڕێوی نیە ، ئەمە ژیانە .. کچەکەم شوو ناکات‌و ڕازی نیە !!!

— وسو ( بە بەدەم قیژاندی ) وسو .. هەر وەك وتم ، تۆ تازە لێرە جێگات نابێتەوە ، خوا حافیزت ، ئەتوانی هەتا ئێوارەش لێرەبیت !

— جارێ زۆر شەرمە بۆ تۆ کە من لە تەمەنی باوکتام .. پێم ئەڵێی ( وسو ) . وە دووەمینیش کە ئەڵێی هەتا ئێوارە لێرەبم .. هەر ئێستا ماڵ ئاوا . وە ئەبێ چاکیش بزانی ئێمە لە برسان نامرین . هەتا ماوین بەسەر بڵندی ئەژین . مل بۆ کەس شۆڕ ناکەین .

دەرگاکەی بەتوندی لەسەر کەلەش زلەکە داخست . بە توڕەییەوە چووە دەرەوە . هەموو گیانی لەرقان ئەلەرزی .. دانەکانی نیشتبوونە سەر یەك .. ترسی خوای لەسکا بوو ، ئەگینا بۆ یەکجاری ئەم نیوە زیندووەی ئەکرد بە مردوو .. بەخێرایی لە دەرگا زلەکەی حەوشەکە تێپەڕی‌و لە کۆشکەکە دوورکەوتەوە .. دوور کەوتەوە بۆ دواجار ئاوڕێکی بێ‌پەشیمانی‌ی لە کۆشکەکە دایەوە .. هەتا هێزی هەبوو تفێکی لێ‌کرد .. بیری لەم پانزە ساڵەی ڕابوردوو ئەکردەوە کە لەم کۆشکە پڕ ئەجندەیەدا بەسەری‌برد .. کەچی‌وا بە بێ مروەتی دەرکرا . گەڕایەوە ماڵ .. خێزانەکە ئەو ڕۆژەیان بە کش‌و ماتی بردە سەر بەڵام مام وسو لە ناخەوە هەستی بە هێزو توانایەکی بێ‌پایان ئەکرد کە چۆن توانی بەرامبەر (گەورەکە)ی ڕاوەستێ .. جار جارەش دڵی کچە غەمگینەکەی ئەدایەوە . کە شەو ویستیان بخەون بانگی کچەکەی کردو وتی :

— کچم .. بەیانی بۆ نوێژ هەڵمسێنە ، پاشان ڕوو ئەکەمە مەیدانی کار بەڵکو خوابکات وەستایەك بۆ قوڕکاری لەگەڵ خۆی بمبات !

بەیانی مام وسو پاش نوێژ ، دوو پاروە نانی زلی کردو ڕووی کردە مەیدانی کار . بەلای کۆشکە بەرزەکەدا تێپەڕی . بۆ دواجار تفێکی لە بەردە لوس‌و نەخشەدارەکانی دیوارەکە کردو .. تۆزێ خێراتر کەوتە ڕێ . ترسا پێش ئەوەی بگاتە مەیدانی کار خۆر هەڵبێ‌و کەس لەوێ نەمێنێ .. هەر بە ڕێوە پاروە نانەکەی بۆن کرد .. تێر بۆنی‌کرد کە پڕی نۆك بوو ، خستیە دەمی‌و بای‌دا !!




## شەش وێنە

یەکەم وێنە :

بەداخەوە
خەڵکی بۆیە کۆبوونەوە
تاکوو تەرمی ساڵی ئافرەت.
بۆ سەیوانی کەمتەرخەمی و
گۆڕستانی بیر چوونەوە
بەڕێ بکەن
چۆن تێ ئەگەن
مافی خۆیانە تێی بگەن
بەڵام دەنگێ لە ناخەوە
شەپۆل ئەدا لە پەردەی گوێم
ئەڵێ : کلیلی گەنجینەی
هەموو ساڵێ بە دەست پیاوە
بۆ ڕوواڵەت
لە ساڵانی چەرخەکانا
تاقە ساڵێکی ناو ناوە
ساڵی ئافرەت

دووەم وێنە :

ئەگەر هاتوو
لە ناو باخچەی چڕی ژینا
لە بەر شنەی پێکەنینا
لە ژێر سایەی درەختێکا
لە وەختێکا
گوڵێ پشکووت
ناوی کچ بوو
هەناسە[illegible]ـەرمی بێزاری
بڵێسەی ئاگ[illegible]ری نەفرەت
پەڕەی ناسکی نەژاکان
ورد ورد لاسکی نەپڕووکان
گەر وا نەبوو
ئەڵێم ئافرەت
وەك مرۆڤێ ، وەکوو پیاوێ
ڕۆژو مانگ و ساڵی ناوێ

سێیەم وێنە :

ئەگەر هاتوو
گوڵە باخێ
لە سەر لقی بەرزی جوانیی
گەشایەوە
بە سرووەی شەماڵی حەزو
خۆشەویستی لەرایەوە
بۆ بلبلی هەڵبژاردەی
لە ژێر سێبەری پەیکەری
دڵداری ڕاستەقینەدا
چەمایەوە
دڕکێ نەبوو
وەکو دڕکەکەی مەم و زین
جەرگی ئاواتی هەڵدڕی
بە گەشاوەیی هەڵوەری

گەر وا نەبوو
ئەڵێم : ئافرەت
وەك مرۆڤێ ، وەكوو پیاوێ
ڕۆژو مانگو ساڵی ناوێ

چوارەم وێنە :

ئەگەر هاتوو
جوانی تەنها بادە نەبوو
شەرابێكی سادە نەبوو
[illegible] مەست بكا
وا بزانێ
لە گەرمەی بەزمو شاییا
لە لوتكەی بەرزی باییا
سەرچۆپی كێشی پارەیە
خۆی خاوەنی ئەو یارەیە
خۆی خواوەندی ئەو یارەیە
وا هەست بكا
كە ئەتوانێ
لە كێڵگەی ئارەزوی پەستا
گوڵی هەستی پێ خوست بكا
گەر وا نەبوو
ئەڵێم ئافرەت
وەك مرۆڤێ ، وەكوو پیاوێ
ڕۆژو مانگو ساڵی ناوێ

پێنجەم وێنە :

گەر جریوەی ئەستێرەی ڕیز
لە ئاسمان هاتە سەر زەوی
ئەگەر هەوری بارانی سۆز
چاوی وشك نەكردەوە
گەر لە گۆشەی مرۆڤەوە
هەر لە نرخی مرۆڤەوە
هێلانەی نازی ئەو ڕیزە
ناو گلێنەی هەردوو چاو بوو
نمە بارانی ئەو سۆزە
سەر ناخی دەروونی پیاو بوو
ئەگەر گورگی
بە ناو لە پێستی مرۆڤا
چاوی سووری كاڵ بووەوە
كەڵبەی تیژی ئاڵ بووەوە
لۆژ لۆژ بەرەو چاڵ بووەوە
ئەگەر وابوو
ئەڵێم ئافرەت
وەك مرۆڤێ ، وەكوو پیاوێ
ڕۆژو مانگو ساڵی ناوێ

دوا وێنە :

ئەگەر ئافرەت
وەك باڵدارێ
ئەو باڵدارەی من ئەمەوێ
هەرگیزاو هەرگیز نەسرەوێ
توانی بە دووكەڵی چرا
بفرێ ، بفرێ ، بۆپێشەوە
وەك ماسییەك
ئەو ماسییەی من ئەمەوێ
بە جۆرێكی وا هەڵكەوێ
بروا بەناو دەریای گرا
بوونی بخاتە كێشەوە
بە دەستی خۆی
بە هەستی خۆی
وەك نەشتەرێ
چوو بە چاوی نەخۆشییا
بە گڕ جەورو خوێن نۆشییا
وەك مرۆڤێ
توانی جێی خۆی بكاتەوە
توانی ڕێی خۆی بكاتەوە
توانی گرەو بباتەوە
دیارە ئافرەت
وەك مرۆڤێ ، وەكوو پیاوێ
ڕۆژو مانگو ساڵی ناوێ

# دوو هۆنراوە

لەتیف هەڵمەت

١ ــ بۆ کچێك کە نەیدیوم

*   *

گوایە دەڵێن : شیعرەکانمت زۆر بە دڵە
گوایە دەڵێن : شیعرەکانمت لەلا گوڵە
گوایە دەڵێن : ئاواتخوازەو سەرەڕۆی بۆ یەك
بینینم ؟





کچێ ، نەکەی بگلێینە ناو ڕووباری ئەوینم
کچێ نەکەی شەیداو تینووی دیدارم بی
کچێ نەکەی خەیاڵ بکەی دەسگیرانو دڵدارم بی
من سەرەڕای ئەوەی کە زۆر لاتو زگارو خەمگینم
هەتا بڵێی لەڕو سیسو ناشیرینم

*   *

٢ ــ بۆ ئەو کچەی خۆشم دەوێ ...
گەر هۆنراوەم بۆ دەریایەك بووتایە
ڕادەوەستاو هەرچی گەوهەر لەبنیایە ،
ڕۆی دەکرد بۆم ...
گەر هۆنراوەم بۆ دارگوێزێك بنووسیایە
وشکیش بوایە
گورج ... گورج ... پەلوپۆی دەکرد بۆم ...
گەر هۆنراوەم بۆ چیایەك هەڵرشتنایە
هەموو دارو بەردەکانی دادەگیرسان
وەك چراو مۆم ...

نەی تۆ بۆچی ... بۆ ... گلارەی چاوەکەم
تەنیا جارێ ناتهەژێنێ هۆنراوەکەم
... ... ...
... ... ...
... ... ...
گەر حەزدەکەی ، لە شەوانی بێداریتا
پەنجەکانم وەکو دە مۆم داگیرسێنە ...
گەر حەز دەکەی تۆ منال بەو
من دەبمە بووکە شووشەو بمشکێنە ...
بەلام مەرۆ ... مەرۆ ... وازم لێمەهێنە ...
...
نیوەشەوەو لە تاریکیی شەوانی زستان دەترسم
لە جنۆکەو شەوەو [illegible] دەترسم
لە خشەی پێی ڕێبواری کۆلان دەترسم ...
دایکم نیە گورگانە شەوێم بۆ بکات ...
بە چمکێکی کۆلوانەکەی حەشارم دات ...
دە گیانە تۆ تەمی ترسم بڕەوێنە ...
...
مەرۆ ... مەرۆ بێ تۆ من لە خۆمیش هەراسم ..
مەرۆ هەتا پرچت درێژ دەبێتەوە ...
خۆم بە گرێی تالێکیدا هەلدەواسم



# پۆستەی بەیان

★ بۆ خاوەنی « **پێشنیارێك لەبارەی یەكتری ناسینەوە** » :

پێشنیارەكەتان بۆ گۆڤارێكی ڕۆشنبیریی وەك «بەیان» دەست نادا . ببوورن . ئەمانەوێ لەوەش ئاگادارتكەین كە پێشنیار بە عەرەبی « اقتراح »ە و « اختراع » نییە ..

★ بۆ خاوەنی « **خونچەی سەهۆڵ لەبەر تیشكی هەتاوێكدا** » :

هەرچەند ڕەخنەكەتان هەندێ بابەتی بەجێی



تیابوو ، بەڵام تێكرا بەشێوەیەكی « خەڵك بەكەم سەیركردن » نووسرابوو ، دەستی ڕەخنە لێگیراوی نەئەگرت بۆ ئەوەی بەچاوێكی ڕەخنەگرانە سەیری خۆیو بەرهەمی بكاتەوە . ئەگەر بتوانن بەشێوەیەكی دەسگرۆییكەرانە ڕەخنە بەجێكانتان دارێژنەوە مەیدانی بیركردنەوە لە بڵاوكردنەوەی ئەبێ .

★ بۆ خاوەنی « **شیعرێكی ئەفەریقیی وەرگێڕاو** » :

شیعرەكە پڕ بوو لە ڕەشبینی .. وەك بڵێی ئەفەریقا كیشوەرێك نەبێ ، وەك دوێنێی



ڤێتنام ، ئەمپریالیزمی هێنابێتە هەژان .. ئێمە ئەبێ بە ڕوویەكی گەشەوە بەرەوڕووی ژیان بڕۆین .

ئەنجا ئەبوو ناوونیشانەكەشت وابنووسییایە : « شیعرێكی وەرگێڕراوی ئەفەریقایی » .

★ بۆ خاوەنی « **ئاواتم .. ئاخ ئەنێژم** » :

بابەتەكەتان بۆ ڕۆژی ئەمڕۆ دەستی نەئەدا . ئەمە لە ڕووی ناوەڕۆكەوە . لە ڕووی تەكنیكیشەوە لاواز بوو ..

★ بۆ خاوەنی « **داوەل** » :

لە گەلێ سەرەوە ، بابەتەكەتان بۆ ڕۆژی ئەمڕۆ ، دەستی نەئەدا .

★ بۆ خاوەنی « **هەناسە وشكەكانی تەزوویەك** » :

هێشتا بابەتی چیرۆكەكەتان لێرە نەبوە بە **مۆدە** . كە بوویش لەوانە نەبێ ڕەوڕەوەی ژیانمان بۆ پێشەوە بەرێ .

★ بۆ خاوەنی « **ڕاسپاردەی ڤانیع بۆ خزمەكانی** » :

پێویست نەبوو ئەو ڕاسپاردەیە بكەیەنین ..

★ بۆ خاوەنی « **پرسیارێك لەبەردەم خواكاندا** » و « **بۆچی ناگەینە خۆر** » و « **ڕازی شەوێك** » و « **نەختەر** » و « **ڕاستییەك** » و « **بەرهەمی چیرۆكی كوردی** » :

ببوورن ، بەرهەمەكانتان بۆ بڵاوكردنەوە نەئەشیا .

# ئاسۆیەو کوێستانە بێ سروەیە

فەرید زامدار

کە بینایم ...
بەرەو جیهانی هەوارگەی ڕووتا ئەکشێ ...
هەنگاوی ڕێ ...
بەگوڕ بۆت دێ ...
باڵداریکی .. خۆشەویستیم ...
ئەوەندەی ... بەدوواتا فڕیم ...
بەبێ وچان ..
سنگی ئاسمانت پێ بڕی!! .
پێت نەگەییم .. پێت نەگەییم ...
من پەروەردەی ... ئاوارەییم ...
من دەستکردی ... ئاوارەییم ...
تاکو من تۆ ... نەدۆزمەوە ...

تاکو تۆ من ... نەبینیمەوە ...
ئەمڕۆ لێرەو .. سبەی لەوێ !! .
بارگەی ڕێی دوور ...



لە هیچ شوێنێ ... لە هیچ شارێ ...
داناکەوێ !! .
من کۆچەرەو ... تۆش کۆچەری ..
لە مەڵبەندی بێ سروەدا ...
من بزرەو ... تۆش بزری ..
لە کوێستانی ... بێ چریەدا ...
من ئاسۆەو ... تۆش ئێوارەی زەردەپەڕی ...
لە کوێستانی ... بێ چریەدا ...
من ئاسۆەو ...
تۆش ئێوارەی زەردەپەڕی !! ..

# دوێنێ دڵ بو
# ئەمڕۆ فارغۆنە

عبدالله پەشێو

دڵی من ، وەکو فەرغۆنی ، قیتاریکە
هەزارو یەك ئێستگەی هەیە !
لە هەر یەکێ لەو ئێستگانە ڕابوەستێ
ڕێبوارێك خۆی تێ دەپەستێ
بەڵام ! لەوەتی دڵی من بۆتە فەرغۆن
ڕێبوارێکی پەستی تیایە
دانابەزێ ..
دانابەزێ ..
لە سوچێکی ، ئەو دونیایە !
ئەو ڕێبوارە ..
بە دوای ناوی [illegible]دا وێڵە
ئەو ڕێبوارە ..
بە دوای چاوی خۆی[illegible] وێڵە
ئەو ڕێبوارە ..
برینمە
ئەو ڕێبوارە :
زەردەخەنەو گرینمە
ئەو ڕێبوارە :
جەنتایەکە ،
پڕی دارو بەردو شاخو داخو
خاکو خۆڵی نیشتمانی شرینمە !

مۆسکۆ
٢٢-١١-١٩٧٤



★ وانیە ژیـان ، ئەئاوا تەنیـا واقیعێکی رەق‌و رووکەش بێت‌و بەس .. یا خاکێکی بەیـارو بێ‌درەو‌و هەژێ‌و هەلاو کەندو لەندو زەندۆڵ بێـت‌و مرۆڤ بـە ئاسانی ، چاوەکانی هەتـەر بکاو لە دوورەوە خەڵکەکی بەدی بکات .

★ ئەم بزووتنەوەیەش ، بەنـدە بـە زەوشـتەکانی ناکۆکی‌و شتی جوێ جوێ ، کـە لـە ئەنجـاما رەنـگی گل‌ملانێ‌یەکی بـەردەوامی نێوانیان ئەڕێژێ .

★ هەندێ کەسی وا هەن ئەڵێن : گوایـە لەبەرچاوی رەشکۆکەی (لەیەك گەیشتن) ئەمەیش ، ژانی ئارەزوێکی تایبەتی هەر گـل ئەکا ، لە پێناوی سـەرەنداز نەکردنی هەندێ لایـەنی کەم‌وکوڕی کەسایەتی کەسەکە .. نـا بەڵکو بەڕوخستنی هەنـدێ چـەکی کارامـەی هێـزو بازویش .

★ ئـەم ترسـە لای شتە باشەکانەوە ـ هێشتا نەگەیشـتۆتە رادەی درکاندنێکی راسـتەوخۆی تەواو .

★ کەسی‌وا هەیە ، زۆر بەکارامەیی دەوری لانـەواز ئەبینێ ، نـەك لەبەر سەر ڕاستی سـات‌و سەواکانی خۆی لەگەڵ خەڵك ، بەڵکو

# بەیارمەتی ئێوە

## راستگۆ

### دنیـایە

★ سەرانسەری ژیان .. هەرچەندیش شتەکانی ورد بنوێنـن یا درشـت ، لـە بزووتنەوەیەکی پەیدەرپەی دایە ... هەرچەندیش ئەم بزووتنەوەیـە سست بێ یا خێراو بەرەو پێنگاڤی جـیا جیا مل بنێت .

شان‌و شپیلك ئەکوتن ، یا هەسـت بـە دڵنـەوازی‌و خۆشەویـستی ئەکـەن ، لەگەڵ ئەوانـەی کە گوایە ئـەزانن لـە نێـو دڵ‌و دەروونـیاندا ، چ شـتێ دائـەڕژێ‌و ئـەوروژێ .. .. بـەڵێ : سـەرەرای هەموانیدا هەیـە .. نـەك لەبەر چـاوی کـاڵی خـۆ مەلاس‌دان ، یا لە ئەنجـامی پاراستنی نهێنیەکان‌و لەبەر پاراستن‌و بەس .. نا بەڵکو ئەو بڕواو متمانەیەی کە لە نێـوان خەڵـكدایە ـ بـە سـەرجـەمی کەم‌و کووڕی‌و سەبارەت بـە تەڵەکەبازی‌و سەرلێ‌شێواندن‌و خـۆ لـە پەرێـزنان .. بەمـەیش مۆرکی گەلۆری‌و بەدنیهادی‌و بەدفەڕی خۆیان پەنجەنوما ئەکەن .

★ کەسی وایش هەیە ، دەوری زیرەکی‌و هێزو ورد

بینــی ئەگیــرن ، نــەك لەبــەر ئــەوەی کــە شانازی بــە خۆیان ئەکەن‌و متمانەیەکی بتەویان بەخودی خۆیان هەیە .. نا بەڵـکو ئەمــەیش چەشــنە (تاکتیك)یکی‌ترەو لە دۆخێکی دیارا ، خەلکی پێ چەواشە ئەکەن .

★ ئەم هەمــوو ئەکتەرە نارەسەنانەو گشـت ئـەم نمایشتانەی کە ئەم خەلکە لەگەڵ یەکا ئەیسازێنن .. لای خەڵـکەکە زۆر بـاش ناسـراون .. هەموویشیان ـ بەدەسـکەمەوە ـ بـاش ئەزانێ ئـەوەی بەرامبەری چۆن هەڵبەزو دابـەزی پێ ئەکا .. ئەوەی بەرامبەریشی وا ئەزانێ ، لە چاوو ڕاوەکەیا زۆر سـەر پەرەو هـەمان ساتیش کەوتۆتە ژێر باری نیگەرانی گومانەوە ، کە ئایا بەرامبەرەکەی بـڕوای بـە دەورەکـەی هێناوە یـانا ؟ سەرباری ئەمەیش حەز ئەکا لەم (یاری‌یە)دا هەربەردەوام بێت‌و بەردەوام ...

★ **دوا بـەدوای هــەر کاتێکش بەندووباوو تەوس‌و لاقـرتێی خەنــۆڵ دەس پێ‌ئەکا .**

**ـ پیاو ئەڵێـن : ژن هیـچ پووچن .**

**ـ ژنان ئەڵێن : پیاو منالن‌و وایش ئەزانن ، گوایە زۆر مەزن‌و پێگەیشتوون .**

**ـ رابەری دەزگا : لەرووی فەرمانبــەرەکەی خــۆی هەڵئەشاخێ ، کەچی لــە ناخی ناخەوەیش ، ئارەزوی لــە قاقـاو تەوســێکی جگەربرە .**

**ـ فەرمانبەرەکەیش ، لـە ناخی ناخەوەی‌دا ، پڕ بەدڵ پێ‌ئـەکەنێ‌و چەپڵـە بــۆ ڕابەرەکەی لێ‌ئەدا ، گوایە بە دەنگێ هاواریەوە هاتوە.**
**ـ تا بە ساوایانیش ئەگا ، دەوری گـریان بۆ دایـك‌و باوکیان ئەگێرن ، وا ئەزانن (ساوایەتی) بە هیچ کلۆجێ نالوێ بکەوێتە نێو تەڵــەی چاووڕاوەوە .**

★ هەمــوو لایـــەك دێوجامـــانەی بەندووبــاو هەڵئەخــەن .. هەمــوو لایەکیش تەماشا ئەکەن .. لە ئەنجاما هەموو لایەك لە خشتەی بردراوە ...

درزی گومان تا دێ بەر فراوانتر ئەبێت .. متمانە نەکـردن تا دێ ، ئـەبێ بە یاسایەکی گشتی .

● **لــە ( راســـتی ) سلەمینەوەیش ، ئـەبێ بە یاسای پاشەکشەیی .**

● **دەی ... ئەوە ... دوایە !!**

---

## تێبینی

بە

لە ژمارە (٣٥)ی گۆڤاری(بەیان)دا کاك ئەحمەد تاقانە لەژێر سەرباسی : ( ئەمین‌فەیــزی )دا وتارێـــکی نووسیوە، لەوێدا قسەیەك‌لە ئێمەوە ئەگێڕێتەوە کــە گۆیا ( کاظم پاشا )مان بـەبـرای سـلتان عبدالحمید داوەتە قەڵەم ، لە کاتێکا کەئێمە لە وتارەکەی خۆمانا بە ژنبــرای سلتانمـــــانووسیوە ، نــەك بە برا ، بــەڵام لــە دەفتــەری‌کوردەواریدا بــە هــەڵە چاپکراوە ، پێویستە ئەمــەبزانرێ .

**شێخ محمدی خاڵ**

## • ڕاگوزاری بەیان •

● هەندێ کەس ، تەنیا لە کولانکەیێکەوە سەیری ژیان ئەکەن ، کە کولانکەیێکی تەسكو ترۆسکی بەرژەوەندەکانی یەکانی خۆیانەو بۆ زامن کردنی هەندێ پێداویست .. کە زۆرجار بنەرەتیو گرنگ نین بۆ ژیان .

ئەم جورە کەسە لەو هەلپەو ململانێیە بەردەوامەیانا بۆ وەدەست خستنی تاسەو ئارەزوەکانی خۆیان ، نەگوێ ئەدەنە دادو فریادی ئەوانەی لەسەر ڕێگادا وردوخاش ئەکەنو نە بایەخێکی ئەوتۆش بە سەرەنجامەکانی کارەکەیان ئەدەن ، هەرچەند نامروفانە بێت ، بەمەرجێك ئامانجەکانی خۆیان وەدیبێت .

● **دوورنی‌یە ئەم جورە ڕەفتارە لەبەر بێ بەشیو ناگزوری وەیا بەهۆی بەندوکۆتی کۆمەلایەتی بێت، کە سنورێك بۆ هەلسوکەوتی ئازادانەی مروڤ دائەنێن .. مروڤیش بەپێی سروشتی خووی خۆی هەمیشە مەتوی ئەو شتانەیە کە ڕێگای کاری لێ بەربەست ئەکەن .**

● ئەوەی کە بێ بەشە لەخۆشەویستیو پەیوەندی‌یە ئاساییەکانی نێو خێزاندا ، زۆر جار بەبێ ئەوەی هەست بەوە بکات کە بەشوێن دلنەوازیو خۆشەویستی‌یا وێلە ، بەبێ یەكو دوو خۆی تور ئەداتە ناو هەر چەشنە باوەشێك ، بەبێ سلەمینەوە لە هیچ شتێك هەوڵ ئەدات هەرچی کۆسپێك لەرێدایە لاببات تەنانەت ئەگەر ئەو جورە هەوڵو کوششە ، لای خۆبشی لەوپەری نزمی‌دا بێت بەمەرجێك ئامانجەکانی بێتەدی وبەس .

● دیارە ئەمە ڕوویکی تری مرۆڤە .... مرۆڤی خودی تایبەتیێتی ، خودی وجودی جیاوازی خۆی ، مرۆڤی تاسەو ڕەنگو خوێن .... هەستو ناهەست ، ناخو دەرەوە ، خێرو شەر ، ئازایی‌و ترسنوکی ، نەبەزیو پاشەکشەیی ..... دژو بەرپەرچی دژ .

● **ئاخو ڕۆژی ئەوە نەهاتووە ، بە جۆرێکی تر بیر لەم ئافریدەیە بکرێت ، نەك وەکو ڕەمزێکی ئەژمارەیی لە موعادەلەیێکی ماتماتیکانەدا .. بەلکو وەکو مرۆڤ .. بەلکی وەك ... مرۆڤ !!!**

● ئاخو ناشێ ئەوەی لەسەرەتاوە وتمان لەبارەی پێداویستە ناسەرەکی‌یەکان .. هەلە نەبێت ؟؟ هەلەیێك کە ئەم چەرخە بەسەر بیرکردنەوەی ئادەمیزادا سەپاندبێتی ؟؟

ئەوە نی‌یە ( ناوبانگ ) ( ڕووالەتی بریقەدار ) لە جیهانی سەرمایەداریدا ڕێگایێکە بۆ ژیانو دەستەبەری پاشەڕۆژ تەنانەت ئەگەر لەسەر حیسابی ئەو پێوانانەش بێت کە مرۆڤی هاوچەرخ متمانەی پێ کردووە !!

● **دیارە ..... گۆمانی زانستانە ، سەرەتایێکی ڕاستە بۆ پێداچوونەوەیێك بەو شتانەی کە بەڕاستێکی بەدەر لە گومانەوە دانراون ... بەرەو تێگەیشتنێکی قولترو ڕاستتری ژیانو مرۆڤ ... بەرەو زانستێکی ڕاستەقینە .**

**● ... دەست نامەرنی**

